

# تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و هۆشیاری کۆمەڵایەتی گەنجان

گۆران زیاد شێخانی

تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و هۆشیاری کۆمەڵایەتی گەنجان

ناوی کتێب : تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و هۆشیاری کۆمەڵایەتی گەنجان

نووسینی : گۆران زیاد شێخانی

تایپ : نووسەر

دیزاینی بەرگ :ئیبراهیم ساڵح

شوێنی چاپ : چاپخانەی چوار چرا

ساڵی چاپ : ٢٠٢٠

نۆبەتی چاپ : چاپی یەکەم

"لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەسپاردنی( ١٤٥٠ ) ساڵی ( ٢٠٢٠)
ی پێدراوە "

سەرنجێك :

خوێنــەری بــەرێز .... ئــەم کتێبــەی لەبەردەســتت دایــە بریتیــە لــە توێژینیەوەیەکی زانستی,کەوەك بەشێك لەتـەواوکاری بۆوەرگرتنی بڕوانامـەی بەکالۆریۆس لەبەشی تەکنیکی میدیا– زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی بۆسالّی خوێندنی ٢٠١٨–٢٠١٩ پێشکەش کراوە.

ئــەم توێژینەوەیــە بەسەرپەرشــتی مامۆســتای بــەڕێز پ.ی.د.(ڕێبــەرگۆران مستەفا) ئامادە کراوە,دوای پەسـەندکردنی لەبەشـی تـەکنیکی میـدیا بەپلـەی زۆر بـاش , هــەروەها زیـادکردنی چـەندزانیاریەکی تـر, بەسوپاسـەوە بەشـێك لەمامۆســتایانی بەشــی تــەکنیکی میدیالــەزانکۆی پۆلیتــەکنیك و پــەیمانگای تەکنیکی سـلێمانی بەرلەبلاّوکردنـەوەی پێداچـوونەوەیان بـۆکردووە, مامۆسـتا بەڕێزەکان بریتی بوون لەبەڕێزان...

( پ.ی.د. یەحیا عمر ڕێشـاوی , پ.ی.د. بهاالـدین احمـد محمـد , د.بـاقر داود د.شوان ئادەم , د. هونەر رسول) .

# پێشکەشکردن

ئەم توێژینەوەیە پێشکەشە بە:

١- هەوڵ و ماندوو بوونی هەموو ئەو مامۆستایانەی کە فێری یەك پیتیان کردووم.

٢- پێشکەشە بەدایك وباوکی بەرێزم کە هەمیشە پاڵپشتیان کردووم پێشکەشە بە گیانی پاکی هەموو شەهیدە رۆژنامەنووسەکان

٣- پێشکەشە بە تەواوی میدیاکارانی کوردستان

# ناوەرۆك

| زنجیره | پێرستی خشتەکان | ژ. پەڕە |
| --- | --- | --- |
| ١ | تایبەتمەندی دیموگرافی سامپڵی توێژینەوە | ١٣٨ |
| ٢ | ئاستی بەکارهێنانت چەندە بۆتۆڕەکۆمەڵایەتیەکان | ١٤٣ |
| ٣ | ڕۆژانە چەند کاتژمێر تۆڕی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنی | ١٤٢ |
| ٤ | کامانەن لەدیارترین ئەو تۆڕەکۆمەڵایەتیانەی کە بەکاری دەهێنی | ١٤٥ |
| ٥ | ئایا بەکارهێنانی هەریەك لەو تۆڕەکۆمەڵایەتیانە هیچ سودێکی کۆمەڵایەتی پێگەیاندویت | ١٤٦ |
| ٦ | ئایا لەوکاتەوەی تۆرە کۆمەڵایەتیەکان بەکار دەهێنی هیچ گۆڕانکاریەك لەهۆشیاری کۆمەڵایەتیت هەست پی دەکەیت | ١٤٧ |
| ٧ | ئایا بەکارهێنانی تۆرەکۆمەڵایەتیەکان بۆتە هاندەرێك تاوەکوو بەشداری کرداریت هەبێت لەپرۆژە هۆشیاریە کۆمەڵایەتیەکان | ١٤٨ |
| ٨ | پێت وایە ئەگەر بەردەوام بیت لەبەکار هێنانی تۆرە کۆمەڵایەتیەکان بتوانیت ببیت بە کەسێکی چالاك بۆ هۆشیارکردنەوەی چوار دەورت لەمەترسیەکۆمەڵایەتیەکان | ١٤٩ |
| ٩ | بەکارهێنانی تۆرە کۆمەڵایەتیەکان بەکام باردا زیانی بەتۆ گەیاندوە | ١٥٠ |
| ١٠ | پێت وایە لەڕووی هۆشیاریەوە تۆرەکۆمەڵایەتیەکان تەواوی پێداویستەکانی بۆ تۆ پڕکردۆتەوە | ١٥١ |

## پێشەکی :

پاش سەرهەڵدانی تۆڕی ئینتەرنێت وپاشان تورەکۆمەڵایەتیەکان و یان تۆڕەکانی بەیەکگەیشتنی کۆمەڵایەتی لەناوەڕاستی نەوەدەکانی سەدەی رابردوو بۆ دروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و زانستی و سیاسی و رۆشنبیری ئەم تۆڕانە بوون بە بەشێك لە ژیانی رۆژانەی بەکارهێنەرانی ،بەجۆرێك رێژەی بەکارهێنەرانی لەسەر ئاستی جیهان زیاترە لە ملیارێك بەکارهێنەر کە زانیاری هەمەجۆر بەشێوەی نووسین و وێنە و ڤیدیۆی تێدا بلاْودەکرێتەوە.

لەمیانی ئەو خزمەتگوزاریانەی کە تۆرەکۆمەڵایەتیەکان خستویانەتە بەردەستی بەکارهێنەرانی وای کردوە کە کەسانی بەکارهێنەر کاریگەر بن بەوتۆڕانەو لەناو ئەوبوارانەشدا پرسی هۆشیاری کۆمەڵایەتی خاڵی بنەڕەتی ئەم توێژینەوەیە دەبێت بەشێوەیەکی گشتی و بەتایبەت لەسەر توێژی گەنجان , بۆگەشتن بە داتا و بنەمای زانستی نویێ و بۆزانین و بەدەست خستنی ئاستی ئەو هۆشیاریانەی کە گەنجان هەیانە دەربارەی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و کاریگەریەکانی دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرەتاکانی زانستی کۆمەڵناسی و دەروونناسی ,چونکە هۆشیاری کۆمەڵایەتی بەپێی

هەلومەرجی کۆمەڵگا و ئاستی رۆشنبیری تاك و جوگرافیای ناوچەیەك بۆناوچەیەکی تر جیاواز و گۆڕاوە .

لەبەر ئەوە توێژەر هەوڵدەدات بە پشت بەستن بەمیتۆدی زانستی کۆمەڵێك سەرچاوە و داتای تازە و ئەنجامدانی راپرسی جۆر و ئاست و رێژەی کاریگەرییەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان دەستنیشان بکات .

لەسەر هۆشیاری کۆمەڵایەتی گەنجان لەپارێزگای سلێمانی ,تاوەکوو داتایەکی زانستی و ئەکادیمی نوێ بەدەست بێت دەربارەی کاریگەریەکان و چۆنیەتی مامەڵەکردنی گەنجان لەگەڵ ئەم تەکنەلۆژیا نوێیە,چونکە تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان وەك میدیایەکی نوێ توانیویەتی خۆی بخزێنتە ناو سمارت فۆن ئامێرە هاوشێوەکانی ئەمەش هێندەی تر پەیوەندی بەستنەوەی گەنجان بەو تۆڕانەوە تۆکمەتر و زۆرتر دەکات .

هەروەها لێکەوتی رێژەی بەکارهێنەران و زۆری جۆر و ئاسانی بەکارهێنانی تۆڕەکانیش دەبنە هۆی دروست بوونی چەند باکگراوندێکی هۆشیاری گشتی بەتایبەت لای گەنجان .

## ١ . ١ ناونیشانی توێژینەوەکە:

ئـەم توێژینەوەیـە بەناونیشـانی (تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان وهۆشـیاری کۆمەڵایەتی گەنجان ) لـەبارەی کاریگەریـەکانی تۆرەکۆمەڵایەتیـەکان وئینتـەرنێت لەسـەر هۆشـیاری بەشـێوەیەکی گشـتی و هۆشـیاری کۆمەڵایـەتی گـەنجان بەتایبـەت لەهـەرێمی کوردسـتان ,مەبەسـتی سـەرەکی ئـەم توێژینەوەیـە قسـەکردنە لەسـەر بەشـێك لەهۆشـیاریەکۆمەڵایەتیەکانی بەکارهێنـەرانی تۆرەکۆمەڵایەتیـەکان هەروەها جۆر و کوالیێتی چەندێتی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان .

## ١. ٢ کێشەی توێژینەوە:

تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان پێکهێنـەرێکی گرنگـە لـە میـدیا نـوێ و کاریگـەرەکان لـەنێو کۆمـەڵگا کراوەکانـدا ,بەتایبـەت لەهـەرێمی کوردستان ئـەم میـدیا نوێیـە بەشـێوەیەکی بەرچـاو بـەکاردەهێنرێت لەلایەن چین و توێژەجیاجیاکانەوە بەتایبەت توێـژی گـەنجان کەلـەم روانگەیـەوە ئـەم تۆڕانـە کاریگـەری لـەڕووی سیاسـی و ئـابوری و هۆشـیاری دروسـت دەکـەن ,بـەڵام لێـرەدا توێژەرهـەوڵ دەدات کاریگـەری ئـەم تۆڕانـە لـەڕووی کۆمەڵایەتیـەوە بخاتـە ڕوو , بۆیـە

توێــژەر بــۆ دیــاری کردنــی کێشــەی توێژینەوەکــە ئــەم پرســیارە ســەرەکیە دەکــات ( ئایــا تۆرەکۆمەڵایەتیــەکان کاریگــەری دروســت دەکات لەسەر گەنجان لەڕووی هۆشیاری کۆمەڵایەتی )؟ پاشان ئـەم پرسیارەسەرەکیە دەکرێت بەچەند پرسیارێکی لاوەکی وەك:

١ ئاســتی بــەکارهێنانی تۆرەکۆمەڵایەتیــەکان لەلایــەن گــەنجانی پارێزگای سلێمانی چەندە ؟ کە وەك نموونە وەری دەگرین .

٢ کامانــەن ئــەو بابــەت و پرســانەی کــە گــەنجان لەمەترســی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان ئاگادار دەکاتەوە ؟

٣ئایــا تۆڕەکۆمەڵایەتیــەکان تــا چ ئاســتێك کاریگــەری و هۆشــیاری لەسەر گەنج دروست دەکەن ؟

## ١. ٣ ئامانجی توێژینەوە :

توێژینــەوەی زانســتی لەئێســتادا بــەرەو تایبەتمەنــدبوون دەچــێت هــەروەها لەهەوڵدایــە تیشــك بخاتــە ســەر هۆکــار و چارەســەر بۆهەرکێشەیەك بۆهەر بوار یان زانستێکی دیـاری کـراو ,لەبـەر ئـەوە توێژەر دەیەوێت لەرێگەی وەڵام دانەوەی ئەو پرسـیارانەی خراونەتـە ڕوو ئامـانجی توێژینەوەکـە بـەدی بهێنێـت بۆئەومەبەسـتە دەکرێـت ئامانجی ئەم توێژینەوەیە لەم سێ خاڵەدا بخەینەڕوو :

یەکـەم : خسـتنە ڕووی واقعـی کاریگەریـەکانی تەکنـەلۆژیا لەسـەر پرۆسـەی هۆشـیاری گـەنجان , هـەروەها دەستنیشـان کردنـی ئـەو لایەنــە خراپانــەی کــە وەك لێکــەوت لەدەرئــەنجامی بــەکارهێنانی تۆرەکۆمەلأیەتیەکان دەکەوێتەوە.

دووەم: هەولّـدان بـۆ دۆزینــەوەی ڕێگـا چـارەی زانسـتی گونجـاو کەدوای ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیە دەخرێتە ڕوو لەکاتێکدا توێـژەر درکیان پێدەکات , یاخوود سەلمێنەرە زانستیەکان دەیسەلمێنن .

سـێیەم : پیشـاندانی ئـەو جیاوازیانـەی کەلـە ئاسـتی کاریگـەری و بەکارهێنانی تۆرەکاندا هەیە, وەك ئەوەی کـە هـەمان جـۆری تـۆری کۆمەلأیەتی لەجوگرافیای جیاواز کاریگەری جیاوازی دەبێت .

١. ٤ گرنگی توێژینەوە:

ئەم توێژینەوەیە گرنگی خۆی لەچەند لایەن و بوارێکدا هەیە, یـەکێك لەگرنگیــەکانی توێژینەوەکــە لەهەلّبــژاردنی خــودی بابەتەکــەوە سەرچاوەدەگرێت , چونکە ئینتەرنێت و میدیای ئەلیکترۆنی بـوارێکی زۆر هەستیارە بـەو پێیـەی کـە ڕاگەیانـدن تـا ئـەو ئاسـتە چـووە کـە ڕینمــوونی کــارێکی بــەهێزی تــاك و کۆمەلّگایە,ئینتــەرنێت و تۆڕەکۆمەلأیەتیـەکانیش بەشـێکن لەراگەیانـدنی جیهانی,لەبـەر ئـەوە دەتوانێت وەرگر ئاڕاستەبکات بۆ ئەو ئامانجەی کە خۆی دەیەوێ .

یەکێکی تـر لەگرنگیـەکانی ئـەم توێژینەوەیـە ئەوەیـە کـە هەوڵـدراوە وەك پێویســـت زانیاریـــەکان دەربـــارەی تۆرەکۆمەڵایەتیـــەکان بەشێوەیەکی گشتی( فەیسبووك,یوتوب,ئینستاگرام,تویتەر) پیشـان بدرێت و باسی لێوەبکرێت .

یەکێکی تر لەگرنگیەکانی ئەم توێژینەوەیە ئەوەیە , کە ئەوکەسانەی لەبواری ڕاگەیاند و وپەیوەندییەگشتیەکان و ڕێکلام و بڵاوکراوەکـانی ئـۆنلاین و پەیوەنـدی نێودەوڵـەتی کـار دەکـەن دەتـوانن سـوودی لێوەربگرن , بەوپێیەی ئەم توێژینەوەیە بەرچاو ڕوونـی زۆری تێدایـە بۆ ئەو بەڕێزانە .

یەکێکی تر لەگرنگیەکان ئەوەیە کە ئەم توێژینەوە هاوکارە بۆ زیاتر چەسـپاندنی لایـەنی زانسـتی بـەکارهێنانی تـۆرە کۆمەڵایەتیـەکان چونکە دەبێتە هـەوێنێك بـۆ هـەموو ئـەو کـادیر و فەرمانبەرانـەی کـە لـەدەزگا جیاوازەکانـدا کـار دەکـەن , چـونکە بەزانسـتی ناسـینی کاریگـــەر و مەترســـی و ســـودی تۆرەکۆمەڵایەتیـــەکان دەتوانێـــت بەرچاوڕوونیەکی زیاتر و ئەزموونی بەکاربەرانی زیاتر بکات

یـەکێکی تـر لەگرنگیـەکانی ئـەم توێژینەوەیـە ئەوەیـە کـە وەرگـر ڕادێنێت لەسەر ئەوەی کە هەست بەگرنگی خۆی بکات لەپرۆسەکەدا دواتر وەك زەنگێکی ئاگادار کردنەوە بـە وەرگـر دەڵێـت کەچـۆن و

بـەچ ئاگادارییـەك مامەڵـە لەگـەڵ پەیامـە جـۆراو جۆرەكانـدا بكـات ئەمەش زیاتر لەبەشـی پراكتیكـی توێژینەوەكـە ئامـاژەی پێـدەكرێت چـونكە لـەپاڵ بـەكارهێنانی هـەموو ئـەو سەرچـاوە زانسـتیانەی كـە لەبەشی دووەمـدا بـەكارمان هێنـاوە بـۆ تـەواو كـاری توێژینەوەكـە و دەوڵەمەنـد كردنــی لەبەشــی پراكتیكــی دەرئــەنجامی راپرســیەكە دەخەینە بەر باس, كە توێژەر ئامادەی كـردوە هـەروەها میكـانیزمی راپرسیەكە و چۆنیەتی كۆكردنەوەی داتاكان لەسەر شێوازی زانسـتی ماتماتیـك بەشـداری پێـدەكرێت لــە نووسـین و ئامـادەكردنی ئـەم توێژینەوەیەدا لە.

لەپاڵ ئەوانەشدا لەسەر شێوەی نەخشـەی دایـاگرامی تـەواوی داتـا و ئامارەكان خراوەتە ناو چوارچێوەی بەشی پراكتیكی توێژینەوەكە .

۱. ٥ جۆر و میتۆدی توێژینەوە :

ئـەم توێژینەوەیـە لـە جـۆری توێژینـەوە وەسـفیەكانە,لەمیتۆدی وەسفیشدا,ئامرازی روپێوكردن بـەكارهێنراوە بەوپێیـەی روپێـوكردن هەوڵێكی زانستیە بۆگەشتن بەداتاو زانیاری لەسەر دیاردەیەك ,لەبـەر ئەوەروپێوكردن بەدیارترین میتـۆدی بـەكارهاتوو لـەبواری راگەیانـدن هەژمار دەكرێت,ئەم توێژینەویـە لەرێگـەی روپێوكردنـەوە هەوڵیـداوە لەسەر پرسی هۆشیاری كۆمەلایەتی گـەنجان لەهەمبـەر بـەكارهێنانی

تۆرەکۆمەلأیەتیـــــەکان ,پاشـــــان باســـــکردنێکی تێرتەســـــەلی تۆرەکۆمەلأیەتیـــەکان بـــدوێت و تیشـــك بخاتـــە ســـەر رەھەنـــدەکانی ئەوچەمکانەی بەکارھێندراوە .

١. ٦ گۆمەڵگای توێژینەوە:

گەنجانی پارێزگای سلێمانی نمایشی کۆمەڵگای توێژینەوەکە دەکەن

١. ٧ســـــامپڵی توێژینـــــەوە: (گوزارشتەلەوکەســـــانەی بەشداربوون لەراپرسی بۆبەشی پراکتیکی توێژینەوەکە)

توێژەر سامپڵێکی نـا ھەرەمـەکی مەبەسـتدار بـۆ (١٠٠) گـەنج لـــــەپارێزگای ســـــلێمانی ھەڵدەبـــــژێرێت بەتایبەتمەنـــــدی دیمۆگرافیەکان ( رەگـەز , تەمـەن , ئاسـتی زانسـتی , خـەرجی مانگانە ) .

١. ٨ توێژینەوەکانی پێشوو:

یەکـەم : توێژینـەوەی ( اسـامە غـازی المـدنی ) لـەژێرناوی (دور شبكات التواصل الاجتماعي في تشكيل الـرای العـام) کەنامەیـەکی ماستەرە لە زانکۆی (ام القری) لە ولأتـی سـعودیا لـە سـاڵی ٢٠١٥ پەسەند کراوە ,گرنگترین ئامانج لـەو توێژینەوەیـەدا بـریتین لـەم خالأنە :

١ – زانینـــی رۆڵـــی تۆڕەکۆمەڵایەتیـــەکان وکاریگەریـــەکانی لەسەردروستکردنی رای گشتی و هۆشیاری لای گەنج.

٢ –زانینـــی ئاسـتی سـود وزیانــەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیــەکان لەلایەن گەنجانەوە .

٣ – دەست نیشان کردنی لایەنی باش و خراپی بـەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان .

پـاش ئەنجامـدانی توێژینەوەکـە توێـژەر لەسـەر شـێوەی راسپاردە چەندخاڵێکی دیاری کردوەکە گرنگترینیان بریتین لە :

١ – بڵاوکردنـــــەوەی هۆشـــــیاری زیـــــاتر دەربـــــارەی تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان تـاوەکوو گـەنجان زیـاتر بەرچـاو ڕوون بـن دەربارەی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان ,چونکە ئەو تۆڕانـە رۆڵێکی گرنگیان هەیە لە دروسـت کردنـی پێگـەی کۆمەڵایـەتی و هەڵسوکەوتی گەنج.

٢ – توێژەر پێشنیار دەکات کە تـۆڕی کۆمەڵایـەتی زیـاتر بـۆ پتـــەوکردنی پەیوەنـــدی کۆمەڵایـــەتی وچارەســـەرکردنی کێشـــــەکۆمەڵایەتیەکان بـــــەکاربێت لـــــەبری ناوزرانـــــدن و بڵاوکردنەوەی بیری شەرەنگێزی

دووەم: توێژینـەوەی توێـژەران ( غـزال مـريم و شـعوبی نـور الهدی)  لـەژێرناوی (تـأثير مواقـع الاجتمـاعی علـی تنميـة الـوعی السياسی ) كە لـە زانكۆی قاسـدی لەسـاڵی ٢٠١٤ پەسـەندكراوە توێژەران ئامانجی توێژینەوەكە بەم شێوەیە دەخەنە ڕوو:

ئامـانج لـە ئەنجامـدانی ئـەم توێژینەوەیـە بریتیـە لـە زانینـی ڕێــژەی بەكارهێنــەر و ئاســتی كاریگــەری و جــۆر و ڕێــژەی تۆڕەكۆمەڵایەتیــەكان و دیــاری كردنــی جــۆری هۆشــیاری لای گــەنجان هـــەم لـــەڕووی تەكنـــەلۆژیای میـــدیایی و هـــەم خۆرۆشـــــنبیركردنی گـــــەنج لەڕێگـــــەی بـــــەكارهێنانی تۆڕەكۆمەڵایەتیـــەكان  لەبەرامبەریشـــدا دوای ئەنجامـــدانی توێژینەوەكـە توێـژەران چـەند سـەرنجێكیان لەسـەر شـێوەی راســـپاردە خســـتۆتە بەردەســـت كـــە بـــریتین لـــەوەی تۆڕەكۆمەڵایەتیـەكان بەرێژەیـەكی بەرچـاو كاریگـەری دروسـت دەكەن لەبەر ئەوە دەبێت گەنج زانیـاری هـەبێت لەهەمبـەر ئـەو تەكنەلۆژیاییە كە دەشـێت بـە بـاش یـان خـراپ كاریگـەری جـێ بهێڵن وهـەروەها بـەكارهێنانی تـۆڕی كۆمەڵایـەتی بەتایبـەت لای گەنجان بۆتە واقعێكی نەگۆڕ و رۆژانە ژمارەی بەكارهێنەری زیاد دەكـات بۆیـە بـاش وایـە زیـاتر گرنگـی بەلایـەنی زانسـتی و

بلاْوكردنەوەی هۆشیاری بدرێت دەربارەی تۆڕەكۆمەلاْیەتیەكان تاوەكوو گەنج هۆشیارمەنداتر مامەڵە لەگەڵ ئەو تۆڕانەدا بكات .

سێهەم : ماستەرنامەی توێژەر (مريم نريمان نومار) لەژێرناوی ( إستخدام مواقع الشبكات الاجتماعية وتأثير فی العلاقات الإجتماعية) كەلە زانكۆی الحاج الخضر لەساڵی ٢٠١٢ پەسەند كراوە توێژەر ئامانجی توێژینەوە لەم چەند خاڵە كورت دەكاتەوە .

١ – زانینی گرنگترین خزمەتگوزاریەكانی پێگە كۆمەلاْیەتیەكان,كەلەم ڕووەوە تەواو لەم توێژینەوەیە نزیكە و دەتوانرێت هاوجۆریەكی تەواو ببینرێت لەنێوانیاندا .

٢ – زانینی ڕۆڵی تەكنەلۆژیای نوێ كە لەڕێگەی میدیای كۆمەلاْیەتی و تۆڕەكۆمەلاْیەتیەكان دەركەوتوون.

٣ – زانینی ئاستی كاریگەری پەیوەندیە كۆمەلاْیەتیەكان كە تۆڕەكۆمەلاْیەتیەكان هۆكاربوون بۆ دروست بوونی بەشێوەیەكی گشتی .

پاش ئەنجامدانی توێژینەوەكە توێژەر چەند راسپاردەیەكی خستۆتە بەرباس كەگرنگترینان بریتین لە :

١ – تـۆری کۆمەڵایـــەتی هۆکـــارێکی کاریگـــەرە بۆدروســـتکردنی هۆشیاری لای بەکارهێنەر ,بۆیە پێویستی بـە فراوانکردنـی فکـری هەیە بەتایبەت لای گەنج.

٢ – پـــــاش دەرکـــــەوتنی رێـــــژەی زۆری بەکارهێنـــــەری تۆڕەکۆمەڵایەتیـــەکان بـــۆ بوارەکـــانی (ســـێکس و بابەتـــەکانی تێربـوونی جنسـی , کـات بەسـەربردن) بـاش وایـە هـەوڵ بـدرێت میکانیزمی چاودێری, یـان کـۆنترۆڵی پێگـەکان بـەرێگای زانسـتی بکرێت .

١. ٩ ئامرازەکانی توێژینەوە :

١ فۆڕمی راپرسی :

توێژەر پشتی بەفۆڕمی راپرسی بەستوە بۆ گەشتن بە ئامـانج و پرسیارەکانی توێژینەوەکە .

١. ١٠ راستی وجێگیری:

توێــژەر کـاری لەســەر راسـتی رواڵــەتی کـردوە بـۆ ئـامرازی کۆکردنەوەی زانیـاری، بـەو پێیـەش پـاش گەڵاڵـەکردنی فـۆڕمی راپرســی بەشــێوەی ســەرەتایی فۆڕمەکــە دراوەتــە چــەند پســـپۆڕێکی بـــواری میـــدیایی وکۆمەڵناســـی بەمەبەســـتی هەڵســەنگاندنی کــەپاش تۆمــارکردنی تێبینیــەکان هاوکێشــەی راســـتی دەرەکـــی = بڕگـــە راســـتیەکان \ کـــۆی بڕگـــەکان

١٠٠X كەواتەراستی دەرەکی =٧٥\٨٤X١٠٠=٨٩٪ کە ئەم ڕێژەیە ئاماژەیە بۆ بەرزی ڕاستی توێژینەوەکە. توێژینەوەکە پشتی بەجێگیری ناوخۆیی بەستوە بۆ داتاکانی توێژینەوە بەبەکارهێنانی هاوکێشەی ئاماری ئەلفاکرونباخ بۆ پرسیارە تەرتیبیەکانی فۆرمی ڕاپرسی کەلەم خشتەیەی خوارەوەدا ڕونکراوەتەوە.

خشتەی (١)

جێگیری توێژینەوە

| بڕگە | ژمارەی بڕگەکان | پێوانەی جێگیری توێژینەوە |
|---|---|---|
| ئاستی بەکارهێنان | ٤ | ٠,٨١٧ |

بەپێی ئەنجامی خشتەی (١) دەردەکەوێت کەجێگیری توێژینەوە لەنێوان (٠,٨١٧ – ٠,٨٩٦) دایە کەئاماژەیە بۆ پلەی بەرزی پێوانەی جێگیری بۆ پرسیارە تەرتیبیەکانی فۆرمی ڕاپرسی.

## ١. ١١ پێناسەی زاراوەکان :

توێژەر بەپێویستی دەزانێت وەك دەروازەیەك پێناسەی ئەو زاراوانە بكات كە بەشێوەیەكی سەرەكی لەتوێژینەوەکەدا بەکارهاتوون .

یەکەم : ئینتەرنێت :بریتیەلەپێرەوێکی جیهانی کەلەرێگەی کۆمپیوتەر و ئامێرە زیرەکەکان رێگە بە بەکارهێنەرانی دەدات زانیارو ئامار ئالوگۆربکەن,ئینتەرنێت یان تۆری پەیوەندی جیهانی هەموو پێگە و سایت و دامەزراوە ئینتەرنێتیەکان دەگرێتەوە کە بەهەمووجیهاندا بلاو بۆتەوە.[١]

دووەم :تۆرەکۆمەلایەتیەکان : تۆرێکی جیهانیە کە لە رێگەی کۆمپیوتەر و ئامێرە زیرەکەکان رێگە بە خەلکی دەدات کە ئالوگۆری زانیاریەکانیان بکەن بەهەموو جیهاندا بوونی هەیە ,کە گوزارشتە لە چەندین پێگە و سایت و ناوەندی ئەلیکترۆنی و ئینتەرنێتی بەخزمەتگوزراری جۆراوجۆر و کوالیتی جیاواز بوونیان هەیە . [٢]

---

[١] د.یاس خضیر البیاتی, الاتصال الرقمی , امم صاعدة امم مندهشة , ,الامارات , ٢٠١٥ , ل ٩٩

[٢] مشتاق طلب فاضل , وسائل الاعلام الاجتماعی وتوجها العدوانی فی التجنید والدعایة للارهاب ,٢٠١٥ ل ١٩٠

سـێهەم : هۆشـیاری کۆمەڵایـەتی : بریتیـە لـە شـیکردنەوەی دەروونی بۆهەموو ئەو شتانەی کە بایەخیان هەیە ودەزانرێت کەی و چۆن و بۆچی بەکاری دەهێندرێت کە ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر تاك وگوزارشتە بۆ هەڵسوکەوتەکانی لەناوکۆمەڵگادا لەهەر بوارێکدابێت.[١]

چوارەم : گەنج :قۆناغی گەنجی سەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤێکە کە گۆڕانکاری جەستەیی و دەروونی و ژیری تێدا ڕوودەدات و هەنگاوەکانی یەکەمین خەملاندن و دەستەبەر بوونی کەسێتی و شوناسی مرۆڤەکان دەست پێ دەکات . کەبەشێویەکی خەملێنراو تەمەنی گەنجی لە (١٢ بۆ ١٨ ) ساڵ دەست پێدەکات .[٢]

---

[١] Eugene mctaughlin, Ross fergusson and Gordon hughes , Restorative justice critical issues , uk , ٢٠٠٣ , p ٩٤

[٢] Angela underwan ,young childrens health and well-being , first puplish ٢٠٠٧ , England ,

## بەشی دووەم ... تیۆری نامە

### ئینتەرنێت :

لەبەر ئەوەی ئینتەرنێت یەکێکە لە زانستە هەرە فراوانەکانی دونیا کە توانیویەتی بەشێوەیەکی زۆر خێراو پێشکەوتوو بخزێتە ناو بەشێکی زۆر لەناوەندە میدیایەکان و دامەزراوە حکومی دەزگازانستیەکان هەرلەبەر گشتگیری و فراوانی ئینتەرنێت وتراوە تۆڕی تۆڕەکان یان قەیسەری تەکنەلۆژیا.

ئینتەرنێت لە زاراوەی (Net) ی ئینگلیزی وەرگیراوە کە بەواتای تۆڕ دێت , بەشێکی تر دەڵێن : ئینتەرنێت لە دوو برگە پێکهاتوە (Inter) مانای چوونە ژورەوە هەروەها دەستەواژەی (Net) بەواتای تۆڕ هەردووکیان مانای چوونە ناوتۆڕ , بەشێکی تر بە دایکی تۆڕەکان ناوی دەبەن.

هەروەها دەکرێت ئینتەرنێت بەوە پێناسەبکەین کە : کۆمەڵێك ئامێری بەیەکەوە بەستراوە بە چۆنیەتیەکی وا کە توانای گۆڕینەوەی داتا و زانیاریەکانیانی هەیە , هەروەها دەتوانین لەسەر ئینتەرنێت

بلـێین کـه ئـامێرێکی پەیوەنـدیکردنی جـەماوەری هاوچـەرخه بـۆ گواستنەوەی هەواڵ و زانیاری لەرێگەی کۆمپیوتەر و هاوشێوەکانی.

سەرچـــاوەکانی ســــەرهەڵدانی ئینتـــەرنێت و پەرەســـەندنی وەك ئامرازێکی پەیوەندی کردن بـاس لـەوە دەکـەن کـه یەکـەم بیرۆکـەی ئینتـەرنێت دەگەرێتـەوە بـۆ سـاڵی ١٩٤٥ , کاتێـك ڤانیڤـار بـوش ئـامێرێکی خسـتەروو و نـاوی لێنـا (Memex Machine) بـۆ رێکخستنی زانینه مرۆییەکان و بەستنەوەیان و توانـای توێـژەران لـه دووباره گەڕاندنەوەی زانیارییەکان بەڕێگـەی ئـەلیکترۆنی , دواتـر لـه سـاڵی ١٩٤٧ کۆمپانیـای (A.T.N.T) ی ئـەمریکی تایبەتمەنـد لـه بواری ترانزیستۆر, هەمان پێڕەوی بونیات نا که بووه هـۆی شۆڕشـی ژمارەیی و تەکنەلۆژی .

دواتر هەڵدانی مانگی دەستکردی روسی بۆ بۆشایی ئاسمـان لەساڵی ١٩٥٧ پاشـان مـانگی دەسـتکردی ئـەمریکی لـه سـاڵی ١٩٥٨ دا دەرگای تـەواوی بـه رووی پێشـکەوتنه تەکنەلۆژیەکانـدا کـردەوه تـا ئـــەوەی لـــه ســـاڵی ١٩٦٩ بـــەهاوکاری ئاژانســـی توێژینـــەوه

پێشکەوتووەکان (ARPA) لە وەزارەتی بەرگری ئەمریکا تۆڕی ئینتەرنێت دامەزرا.

پاشان دەزگای زانستە نەتەوایەتیەکان لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەستی کرد بە پێکهێنانی پەیکەری ئینتەرنێت [1], هەروەها بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٨٢ دەستەواژەی internet بۆ هەڵگرتن و پاراستن و ئاسانگەشتن بەزانیاریەکان بەکارهێندرا ئەوەش لە ڕێگەی بەستنەوەی شەش ناوەندی کۆمپیوتەری زەبەلاح بە پێڕەوی پەیوەندیکردنێکی خێرا.

هەروەها پەرەپێدانی تۆڕی جاڵجاڵۆکەی جیهانی ناسراو بە (WWW) لەسەر دەستی (بیرنرزلی ) لەساڵی ١٩٨٩ کە ئەمە بەیەکێك لە گرنگترین پەرەسەندنەکانی ئینتەرنێت دادەنرێت دواتر لە ساڵی ١٩٩٥ شەش ملیۆن و پەنجا هەزار پێگە و تۆڕی لاوەکی

[1] د.عبدالفتاح التميمي و د.وليد سلامه , الشبكات المعليه والانترنت , , قاهره , ٢٠٠٧ , ل ٤٢

یەکێك لەکۆمپانیاکانی کۆمپیوتەری خۆکاری کە بەرنامەی (گەڕان)ی داهێنا پەیوەندیان بەتۆڕی ئینتەرنێتەوەکرد[1]

ئینتەرنێت دەرئەنجامی ئەو پێشکەوتن و گۆڕانکارییەخێرایانەیە کە جیهان ڕووبەڕووی بۆتەوە , لەگەڵ ئەوەی لەسەرەتادا پرۆژەیەکی حکومەتی ئەمریکا بوو, بەڵام بەتەوای بەجیهاندا بڵاوبۆیەوە ئەگەر وورد‌تر لەسەر چەمکی ئینتەرنێت قسەبکەین و بڕوانین لە وتەی زانای ناودار (مارشال ماکلۆهان) کە جیهان بۆتە گوندێکی بچووك بەتەواوی خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتی و سیاسی و دەروونیەکان ئەوە ئینتەرنێتە ئەو ڕۆڵەدەگێڕێت [2]

دواتر لەساڵی ١٩٩٨ یەکەم جولێنەری گۆگڵ Google دەرکەوت و لەساڵی (٢٠٠٢) نزیکەی (٣) ملیۆن یەکەی لای خۆی تۆمار کرد دواتر لەساڵی (٢٠٠٤) دا سایتەکەسیەکان دەرکەوتن (Blogs) .

[1] بەهادین احمد , و. رابەر رشید , پەیوەندیە گشتیەکان لەدامەزراوەکانی راگەیاندن , ,چاپخانەی چوارچرا چاپی یەکەم , ٢٠١٩,ل ٧٠

[2] د.ماهر عودةالشمالية , د.محمود عزت للحام ,د. مصطفى يوسف كافى , الاعلام الرقمى الجديد, عمان , چاپی یەکەم , ٢٠١٥ , ل ٤٢

هەر لە حەفتاكانی سەدەی ڕابردوو ئینتەرنێت گەشەكردنێكی زیاتری بەخۆییەوە بینی و توانرا بۆ یەكەمجار پەیوەندی ببەسترێ لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە لە نێوان ( لەندەن و نەرویج ) دا كە ئەمەش بە سەرەتای گەشەی ئینتەرنێت دادەنرێت[1]

لەساڵی (١٩٩٠) (تیم بیرنرزلی) لە تاقیگەی ناوەندی ئەوروپا بۆ توێژینەوەی وزەی ئەتۆمی (CERN) لە شاری ژنێف زمانی (HTML)ی داهێنا ، ئەمەش بووە شێوازێكی زۆر ئاسان بۆ بەیەكەوەبەستنەوەی زانیارییەكان لەسەرتاپای ئینتەرنێت دا.

هەروەها ڕێگەی خۆشكرد بۆ پەیدابوونی تۆری جیهانی (WWW) كە لەماوەی چەند ساڵێكدا لە تۆڕی باسكراو گەشەی سەند ، كە ئەو ژمارەییەی پێشوو لە ساڵی (١٩٩٢) دا بۆ ملیۆنێك ئامێر بەرزبوویەوە و لەساڵی (٢٠٠٠) بوو بە ٢٠٠ ملیۆن و ئەمرۆش بە نزیكەی ( ٢ بۆ ٣ ) ملیار ئامێر دەخەملێندرێت كە پەیوەستن بە ئینتەرنێتەوە هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی كە لە ڕێگەی كۆمپیوتەرە كەسییەكانەوە سود لە ئینتەرنێت وەربگیرێت[2]

---

[1] د.یونس شوكرا ,و. ڕەحیم سورچی, هەواڵنوسی مۆدێرن, چاپی یەكەم چاپخانەی ئاراس ٢٠١١ لا ٣٧

[2] سایتی ئەلیكترۆنی www.kurdipedia.org ٢٠١٩/١/١٥

وەك دەزانین کە ئینتەرنێت خۆی لەخۆیدا یەکەیەکی سەربەخۆ نیە کەناوی ئینتەرنێت بێت ,بەڵکو ئینتەرنێت لەپێکهاتە و یەکێتیەك پێك دێت (Combination) کە کۆمەڵە ئامێرێکی پەیوەندی کردنە پێکەوە لە پێڕەوێکی تەواودا کاردەکەن یەکەکانیش برتین لە :

١. کۆمپیوتەر : بەشێکی بنچینەیی و سەرەکییە لەوپێڕەوە فراوانەدا , کەئەویش تۆڕی ئینتەرنێتە بۆیەکەم جار بونیادی کۆمپیوتەری لەسەر دەستی زانا(جۆن فینستین ئەتانسوف) لەساڵی ١٩٣٩ لەزانکۆی ئۆوای ئەمریکا و دواتر زانای بەناوبانگی بەریتانی (الان ترینگ)توانی کۆد (شفره) زانیارییەکان بخاتەگەڕ کە بۆیەکەم جار لە جەنگی جیهانی دووەم ئەڵمانیەکان سودیان لێوەرگرت ,دەکرێت وەك فاکتەرێکی گرنگ بۆ زوو گەشەکردنی کۆمپیوتەر نموونەی جەنگ و ململانێ سیاسیەکان وەربگرین کە هۆکارێکی سەرەکی بوون کە دواجار ولەساڵی ١٩٤٦ توانرا بەهاوکاری کۆمپیوتەر نموونەی سێ موشەکی (٣٠) تەنی بەگەربخەن و کۆنترۆڵبکرێن بەکۆمپیوتەر[١] , کە بەشێوەیەکی

---

[١] د.یاس خضیر البیاتی, هەمان سەرچاوەی پێشوو, ل ٢٢

گشتی سیستمی کۆمپیوتەر لەچوار یەکەی سەرەکی پێك دێت کە بریتین لە :

بەشی داخلکردن (تێچوون) Input devices

بەشی چارەسەرکردن (رێکخستن) Processors

بەشی دەرچوون (دانەوە) Output devices

بەشی بـارکردنی ناوەنـدی ( خـەزنکرد) Secondary stronge device [1]

یەکێك لە کێشە هەرە گەورەکان کە بەردەوام مەترسین بۆ سیستمی کۆمپیوتـەر بریتیەلـە ڤایرۆسـی کۆمپیوتـەری ,کـە ئـەم ڤایرۆسـانە بەشـێوەیەکی رێکخـرا و لەلایـەن کـەس یـان گروپـی دیـاری کـراو ئاراستەی سیستمە ئەلیکترۆنیەکان دەکرێـت , لەناویانـدا کۆمپیوتـەر یەکێکـە لـەو ئامێرانـەی کـە زۆرتـرین زەرەرمەنـدی ئـەم بابەتەیـە ڤایرۆسی کۆمپیوتەری بریتین لە کۆمـەڵێك داتـای نـاڕوون کـە بەسـەر چەند یەکەیەکی ژمارەیی زمانی کۆمپیوتەر دابەشـکراوە کـە توانـای

١ د.عماد عبدالوهاب الصباغ , علم المعلومات , دار الثقافة للنشر والتوزيع الاردن , ل ٨٥

تێکدانی  زمانی کۆمپیوتەری هەیە کە کۆمپیوتەر وەك ئامێر هەروەها ئەوبەرنامانەی کە لەرێگەی کۆمپیوتەرەوە بەکار دەهێندرێت بەشێوەیەکی زۆر مەترسی دار  تێك دەدات , ڤایرۆسی کۆمپیوتەر بۆ بەشێك لە ناوەندە بانکیەکان و ناوەندە ئەمنیەکان و دەزگاکانی پەخشی تەلەفزیۆنی و وێستگەکانی ئینتەرنێت هتد.

ئاڕاستە دەکرێت  زۆرجاریش توانیویەتی تەواوی سیستمی کۆمپیوتەری تێك بدات و شفرە و کۆد و داتاکان لاببات یان بیانگۆرێت , ئەوەی کە زانراوە یەکەم جۆری ڤایرۆسی کۆمپیوتەری لە ساڵی ١٩٨٣ لەباشوری کالیفۆڕنیا لەلایەن خوێندکارانی زانکۆی ئەو وڵاتە دروستکراوە ئەوکات بەمەبەستی پارێزگاری لە سیستمی کۆمپیوتەر دروستکراوە بۆ ئەوکۆمپیوتەرانەی کە وردن  لەئیشکردندا Microcomputerوەك کۆمپیوتەری تاقیگە پزیشکیەکان و ناوەندە ئەمینەکان . هتد .

لەئێستادا بەشێوەیەکی گشتی و بەنزیکی (١٥٠٠) جۆری ڤایرۆسی کۆمپیوتەری هەیە , کە کاری بەشێکی زۆریان بۆتێکدانی سیستمی کۆمپیوتەر و تۆڕەکانی ئینتەرنێتە .[١]

٢. کێبڵەکان : Cable بریتیە لەو تەلانەی کە بۆ بەستنەوەی خزمەتکارەکان بە وێستگەکانی کارکردنەوە بەکاردێت هەروەها لەگەڵ یەکتردا کار دەکەن بۆ پێکهێنانی تۆڕێکی راستەوخۆ .

٣. مایکرۆوەیڤ : Micro wave پێشی دەوترێت شەپۆلە زۆر وردەکان , کە بریتین لە پێرەوێکی ئەلیکترۆنی بۆ پرۆسەی پێوەندیکردنەکان , کە بۆ مەبەستی بەستنەوەی رووبەرە لەیەك دورەکان لەنێوان تاوەرەکان یان کاری هەناردە تەلەفونیەکان یان جوولەی ئەو تەلیفۆنە هەناردەکراوانە هەڵدەگرێت بەمەبەستی بەهێزکردنیان لەخاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر .

٤. مۆدێم : Modem کرداری گەیاندنی ئینتەرنێت لەرێگەی تەلیفۆنەوە ,هەر دەبێت لە میانی بەکارهێنانی ئامێرێکەوە بێت کە پێی دەوترێت (modem) ئەویش کوتکراوەی ناوی دوو

---

[١] د.عماد عبدالوهاب الصباغ , هەمان سەرچاوەی پێشوو , ل ٢٢٧

ئـاميرە کـە ئـەوانيش Monulator Demodulator کـە هەردووکيان کاريان گۆرينی ئامـاژە ژمارەييـە کۆمپيوتەرييەکانـە بۆ ئاماژە تەليفۆنيەکان بە پيچەوانەوە , مۆديۆم وەك دەرگـەوان وايـە بـۆ کۆمپيوتـەری بەسـتراوە بـەتۆری ئينتـەنيت , چـونکە ئەرکێکی دياريکراو و گرنگ ئەنجام دەدات .

٥. مانگـە دەسـتکردەکان : satellites کـەبريتين لـەو مانگانـەی لەسەر تەوەری جێگير و تـەوەری مامناوەنـد لەسـەر گـۆی زەوی بلأودەکرێنەوە , کە خزمەتگوزاری پـەيوەندی کردنـی جـەماوەری لە تەلەفزيۆن و تـەليفۆن و فـاکس و گۆرينـەوەی زانيـاری و داتـا پێشکەش دەکەن .[١]

نموونـەی چـەند کورتکراوەيـەك کـە گوزارشـتن بـۆ گـەڕان لـەناوتۆڕی ئينتەرنێت .

| دەستەواژە | رونکردنەوە وبەکارهێنان |
|---|---|
| Com | بۆ پێگە بازرگانيەکان بەکاردێت |

[١] بەهادين احمد هەمان سەرچاوەی پێشوو . ل ٥٠

| | |
|---|---|
| زیاتر بۆ پەیوەندی نێوان تۆڕەکان بەکاردێت | Net |
| لایەنی پەروەردەیی | Edu |
| لایەنی پەیوەندی دار بە حکومەت | Gov |
| وڵاتان | Fr |
| | Uk |
| | Sa |

**تایبەتمەندیەکانی ئینتەرنێت :**

١- خێرایی لە بڵاوکردنەوەی زانیاریەکان Information Puplishing Speeding

٢- گۆڕینەوەی بەڵگەنامە و قەواڵەکان Documents Exchange

٣- نهێنی گۆڕینەوەی زانیاریەکان و پشتبەستنیان بە پێوەری جوفرە (جفرە) Encryption

٤- کەمی بڕی تێچوو Low Costs

٥- ئاسانی بەکارهێنان Accessibility or Ease of Use

٦- تازەیی و دەم و دەستی new and Breking

٧- کارلێککاری Interactivity [1]

## سودەکانی ئینتەرنێت :

١-وەك سەچـاوەیەکی زانیـاری : وەك ئـامرازێکی یارمەتیـدەر بـۆ ڕومالّی هەوالّ و زانیـاری، یـان وەك سەچاوەیەکی سـەرەکی ڕومـالّی ڕوداوە کتوپڕەکـان ، ئـەوەش لەڕێگـەی پێگـە هەوالّیەکانـەوە ،یـان پێگـەی ڕۆژنامـە و ئاژانسـەکانی هەوالّـەوە،یان ڕادیـۆ یـان کەنالّـە تەلەفزیۆنەکانەوە.

٢ -سـود لێـوەرگرتن وەك هۆکـارێکی پەیوەنـدیکردن : هۆکـارێکی پەیوەنـدیکردنی تایبـەت بـە پـەیامنێرەکان کـە لەڕێگـەی پۆسـتی ئەلکترۆنیـــەوە یـــان ئـــامرازە ڕۆژنامەوانیـــە ئینتەرنێتیەکانـــەوە وەك(بابەتـە ڕۆژنامەوانیـەکان) دەگوازنـەوە،یان بەیەکـەوە گرێـدانی

[1] د.بەهادین احمد , هەمان سەرچاوەی پێشوو , ل ,٥٧

سـەرجەم بەشـەکانی دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن و ئەنجامـدانی کـرداری ئاڵوگۆڕی زانیاری لە نێوانیاندا بە تایبەتی ژووری هەواڵ.

٣ -سـودوەرگرتن لـە تـۆڕی ئینتـەرنێت وەك ئـامرازێکی پەیوەنـدی کردن و کارلێکی ڕاستەوخۆ و زینـدوو لـە نێـوان نێـرەر و گەیەنـەردا، هەروەها فەراهەمکردنی زەمینەیەکی لـە بـار ,هـەروەها رەخسـاندنی کات و ڕووبەرێکی فراوان بۆ بەکارهێنەران تابتوانن هاوکـات سـەرنج و تێبینیەکانیان بخەنەڕوو.

٤ -سوود وەرگرتن لـە ئینتـەرنێت وەك ئـامرازێکی ڕۆژنامـەوانی واتـە هـــەواڵ هەیـــە و کـــەناڵیش هەیـــە و وەرگـــریش هەیـــە, بـــەڵام وەك رۆژنامەیـــەکی کاغـــەزی وجـــودی نیە ,بـــەڵکو لەســـەر پێگەیـــەکی ئەلیکترۆنی  یان ڕۆژنامەگەری ئەلکترۆنیدا یـان کۆپیـەکی ئـەلکترۆنی خـودی ڕۆژنامەکاغەزیەکـە یـان ڕۆژنامەیـەکی ئـەلکترۆنی ڕاسـتەقینە بێت .

٥ -تـــۆڕی ئینتـــەرنێت بـــۆ کـــاری ڕیکـــلام بـــە هـــەموو جـــۆر و شـــێوازەکانیەوە ســـوودی لێوەردەگیرێت،بـــە تایبـــەتی ڕیکـــلام وەك هونەرێکی ڕۆژنامەگەری ئینتەرنێت, رێکـلام بەرێژەیـەکی زۆر سـودی

له ئینتەرنێت بینیوە تەنانەت چەندین کۆمپانیای گەورەی جیهانی بۆ ماوەیەکی کەم چەندین ملیۆن دۆلار دەدەن بە ئینتەرنێت لەبەرامبەر ریکلام کردن بۆیان , بەهەمان شێوەی ریکلام پروپاگەندەش کە لەلایەن پارتەسیاسیەکانەوە بانگەشەی بۆدەکرێت یەکێکی ترە لەو سەرچاوە زەبەلاحەی دارای ئینتەرنێت .

٦ -لە پرۆسەی بە جیهانبوونی ئابووریدا،تۆری ئینتەرنێت وەك گرنگترین فەکتەری خزمەتگوزاری ئەوبوارە لە قەڵەم دەدرێت، لە چوارچێوەی بازرگانی ئەلکترۆنیدا.

٧-بڵاوکردنەوەی بیروبۆچون مەبەستی کارکردنە سەرهەست و سۆزی بیروباوەڕی جەماوەر و ئەنجامدانی ڕەفتارێکی دیاریکراو کەلەبنەڕەتدا ئەمە ئیشی سەرەکی میدیایە بەشێوەیەکی گشتی بەڵام ئینتەرنێت پرۆسەکەی کاریگەرتر و خێراتر کردووە .[1]

٨- هاوکاریکردنی داهێنەران بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانیان لەبواری ( هونەری سیاسی , فکری ,وەرزشی , یاریەئەلیکترۆنیەکان ) بۆنموونە دروستکەری یارییەکی

---

[1] د.رضا عبدالواحد امین ,الصحافة الکترونیة, چاپی یەکەم چاپخانەی دارفجر القاهرة ٢٠٠٧

ئـەلیکترۆنی کـە لەرێگـەی ئینتەرنێتــەوە کاردەکـات ئینتــەرنێت بۆتەهۆکارێکی گرنگ بۆبرەودان بەفکر و گۆرانکارییە ئابوریەکانی جیهان, بەنموونەی (پۆپجی) [1]

## لایەنەخراپەکانی ئینتەرنێت :

هــیچ شــتێك بــی کــەم و کــورِی و لێکــەوتی خــراپ نیــە ,لەکاتێکـدا ئینتەرنێت ئەو خزمەتگوزاریانە پێشکەش دەکات کـە باسمـان کـرد لەهەمان کاتدا دەرئەنجام و کاریگەری ولایەنی خراپـی هەیـە ,یـەکێك لــەو مەترسـیانە (ڤایرۆســی کۆمپیوتەریــە ) کەبەشــەکانی پێشــوودا ئاماژەمان پێکرد , لە دەرئەنجامەخراپەکانی ئینتەرنێت بریتیەلەوەی کە کەسانێك زۆر بەئاسانی دەتوانن ببن بە سەرچاوەی بڵاوکردنەوەی (رِق وکینـــە) و بڵاوکردنـــەوەی وێنـــەی (ســـێکس)ی و هونـــەری دروستکردنی تەقینەوە و خەڵك کوشتن و شوێنی کـرِین و فرۆشـتن و یەکلایی کردنـەوەی مـاددە هۆشـبەرەکان هـەموو ئـەو هەڵسـوکەوتە نەویستراوانەی کە لەکۆمەڵگادا هەن لەیاسا یاساغن .

---

١ عقيد .د. فهد بن عبدالعزيزالغفيليى , الاعلام الرقمى ,ل ١١

هەروەها ئینتەرنێت بۆتـە سەرچـاوەیەکی بەکارهێنـەر بـۆ فێرکردنـی کردەوەی خۆکوژی و هونەرەکانی دزی کردن و کوشـتن و فیڵـەکانی خۆڵکردنەچـاوی خـەڵك , کـە بۆهەمووئەوانـە گروپـی چـەتەی ئینتـەرنێتی دروسـت بـوون کـە تـەواوی ئـەو تاوانانـە بەشـێوەیەکی رێکخراو ئەنجام دەدەن , بۆنموونە تاوانەکانی( Dark Room) کـە زۆرترین و قێزەونترین تاوانە ئەلیکترۆنیـەکانی تێـدا ئـەنجام دەدرێـت جگـە لەوانـە تـاوانی کێشـانەوەی زانیاریـەکان (السـحب الکترونـی) هـەروەها چـاودێریکردنی (سیاسـی , فکـری ناسیۆنالیسـتی ئایـدۆلۆژی ) پاشـان هـاککردن و یـاریکرد بـە زانیاریـەکانی دەزگـا ئەمنیەکان .[1]

هـەروەها یـەکێکی تـر لـەو لێکەوتەخراپانـەی کـە لەدەرئـەنجامی سـەرهەڵدانی ئینتەرنێتـدا دروسـت بـووە بریتیەلـە دروسـت بـوونی دڵەڕاوکێ ,بەتایبەت لەو کۆمەڵگایانەی کـە کلتـور و یاسـاو و ئاسـتی رۆشنبیریان لە قۆناغی گواستنەوەدان ,چونکە گومـان لەوەدانیـە کـە

[1] مصعب حسام الدین فتلونی , ثورات الفیسبوك ,الطبعة الاولی ,بیروت , ٢٠١٤,ل ٨٤

ئینتــەرنێت هاوتەریبــە لەگــەڵ کێشــە فســیۆلۆژیەکان و گۆڕانــە سروشتیەکان .[1]

هەروەها بەشێك لەشارەزایانی بواری ئینتەرنێت جگەلەو خاڵانەی کەباسمان کرد نموونەی چەند لایەنێکی تری خراپی ئینتەرنێت باس دەکەن لەوانە :

١- شێواندنی مافی بڵاوکردنەوە و ناڕوونی سەرچاوەی ئەو بابەت و زانیاریانەی کە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاو دەکرێنەوە .

٢- پەیوەندی ئینتەرنێتی جیاوازە لەگەڵ پەیوەندی جەماوەری چونکە پەیوەندی ئینتەرنێتی پەیوەندیەکی کەسیە و لەسەر ئاستی تاك زیاتر بەکاردێت بەو مانایەی هەرکەس خاوەنی پێگەی تایبەتی خۆی و بە پاسۆردی تایبەتی خۆی بەشدارە .

٣- باشترین و ئاسانترین ڕێگایە بۆ بەکارهێنەرانی کە بیانەوێت دەربارەی بابەتی سێکسی و چێژبینین لە گرتە و چات و دەنگی سێکسی , کە گومان لەوەدانیە مرۆڤ بەرەو ئالودەبوون و لەدەستدانی کەسایەتی و داروخانی دەروونی دەبەن .

---

١ لوسيان سفيز , ترجمة, مرح على ابراهيم , التواصل عبر وسائل الاعلام والاعلان , بيروت , ٢٠١١, ل ١٢٠

٤- بەکارهێنانی وشەی نەشیاو جنێو و سوکایەتی کردن لەرێگەی ئینتەرنێتەوە چونکە یاساکانی ئینتەرنێت تارادەیەك کراوەیە هەروەها کەم نین ئەوکەسانەی لەسەر خراپ بەکارهێنانی ئینتەرنێت سزادرابن .

٥- بابەتی هاك زیندووترینی ئەو باسانەیە کە وەك لایەنی خراپی ئینتەرنێت هەژماردەکرێت , چونکە ئینتەرنێت لەمرۆڤدا لەلایەن (سیاسی , بازرگان , کۆمپانیاکان , دامەزراوە بانکیەکان و دامەزراوە ئەتۆمیەکان ) هتد. بەکاردەهێندرێت , گرنگی و بایەخی ئەو ناوەندانە جۆرێك چاوچنۆکی و دەستکراوەیی بە چەتەکانی ئینتەرنێت داوە بۆ ئەوەی کە هەوڵی دزی ئەلیکترۆنی بدەن (هاك) کەلەمرۆدا چەندین باندی بەناوبانگ هەن کە تەنها کاریان هاککردنی ناوەندە زەبەلاحەکانی جیهانە , ئەمە جگە لەو مەترسیەی کە زۆر جار زانیاریەکان لەلایەن خوودی کۆمپانیا گەورەکانی ئینتەرنێت دزەیان پێدەکرێت و تەواوی نهێنیەکان لەبەرامبەر سودێکی ماددی یان مەعنەوی بڵاو دەکرێنەوە یان دەدرێن بەولایەنەی کە بەدوای ئەو زانیاریانەوەن .

جۆر و کوالێتی و نرخی کرێی بەکارهێنانی ئینتەرنێت , جیاوازی توانا و جۆری شەبەکەکان هەروەها مەترسی تەقینەوەی ریسیڤەرە گەورەکانی جیهان و لەکارکەوتنی کۆمپیوتەرە بەیەك بەستراوەکانی ئینتەرنێت و بابەتی قۆرخکاری لەداهاتوودا لەلایەن ولأتانی خاوەن سەرمایەی ئینتەرنێتی و چەندین بابەتی تر لەچوارچێوەی ئەو خاڵە سلبیانە باس دەکرێت کە ڕووبەڕووی ئینتەرنێت دەکرێنەوە .[1]

## تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان :

ئەو ڕێگا تازەیەیە کە بەکارهێنەرانی بەهۆیەوە دەتوانن پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کەسانی تر دروست بکەن[2].

تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان هەموو ئەو پێگە ئینتەرنێتیانە دەگرێتەوە کە بەهۆیەوە پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی زانیاریەکان ئەنجام دەدرێت تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان گۆڕانکاریەکی درێژکراوەی لە چەندێتی و چۆنیەتی پەیوەندیەکۆمەڵایەتیەکاندا ئەنجامدا ,هەروەها تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان باشترین ڕێگاچارەی ویستی بەکارهێنەرە کە دەتوانێت هەر بابەتێك کە تاك یان کۆمەڵگا بیانەوێت بۆیان دابین

[1] د. محمد سید محمد, وسائل الاعلام من المنادى الى الانترنيت ,دار الفكر العربى , ٢٠٠٩, ل ٧٥

[2] تاژان دڵشاد ,گۆڤاری رۆژنامەنووس ,ژمارە (٣٢),سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان , زستانی ٢٠١٣ میدیای کۆمەڵایەتی , ل ١٧٦

بکات, هەروەها زۆری و جیاوازی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانە وای کردووە هێندەی تر بەکارهێنەرانیان ئالودەی بەکارهێنانی بن کەتەواو کۆمەڵگاکانی لەیەکتری نزیك کردۆتەوە بەخێرایەکی زۆر ونەهێشتن یان کەمکردنەوەی هەموو سنورەجیهانیەکان , یان کە دەوترێت برتین لە هێڵی گەرم و خێرا و ڕاستەوخۆ بۆ ئالوگۆڕی زانیاریەکان.[1]

تۆرەکۆمەڵایەتیەکان: بریتیە لەهەموو پێگە ئینتەرنێتیەکان ,کە گوزارشتە لە زانیاری و داتا ,یان بریتیە لە تەواوی پرۆسەی گواستنەوەی زانیاری لە سەر شێوەی دەنگ و رەنگ و وێنە وچاتەکان[2] .

مێریەم وێب سەر کەسایتێکی فەرمی بواری ڕاگەیاندنە بەم جۆرە پێناسەی تۆرەکۆمەڵایەتەکان دەکات و Merriam – Webster دەلێت : پێگەگەلێکی ئەلیکترۆنین بۆ پەیوەندی کردن لەنێوان تاکدا,لەرێگەی بەکارهێنانی تۆڕی ئینتەرنێت بەمەبەستی ئالوگۆڕکردنی زانیاری (وێنە,داتا,ڤیدیۆ)[3] .

---

١ د. على على فهمى , استعمال الانترنيت فى تمويل الارهاب وتجنيد الارهابيين ,الرياض , ٢٠١٢ چاپی یەکەم , ل ٩٥

٢ د.فيصل أبو عيشة , الإعلام الالكتوني , چاپی یەکەم ,عمان ,ساڵی ٢٠١٠ ,ل ١٠٧

٣ www.merriam-webster.com/dictionary/social٪٢٠media لەبەرواری ٢٠١٩\١\٢

نوسـەری بـەناوبانگ جێرمـی هـارس لـە کتـێبی Social Media Communication دا بەم جۆرە باس لە سۆشیال میدیا دەکـات و دەڵێــت : سۆشــیال میــدیا بریتیــە لــە پرۆســەیەکی تــەکنیکی کــارلێککراو (interactive)لەگــەڵ خزمــەتگوزاری ئینتــەرنێت کــەدەتوانێت ببێــت بــەژێرخانی (infrastructure) پەیوەنــدی کردنــــی جــــەماوەری و دەتوانێــــت پێچــــەوانەی ڕێســــایی گشتی(paradoxical) کاربکات .[1]

ســایتی ئــەنقیل میــدیا بــەم جــۆرە بۆچــوونی خــۆی دەخاتــە ڕوو دەربــارەی تــۆری کۆمەڵایــەتی Anvil Media دەڵێــت : تــۆرە کۆمەڵایەتــەکان چــەتر ئاســا بونیــاد نــراوە تــاوەکوو بڕێکــی زۆری زانیاری تیادا بڵاو بکرێتەوە و ئاڵو گۆری زانیاریەکانی تێدا بکرێت .[2]

تێروانینێکتر دەڵێت : نووسینە ئەلیکتۆنیەکان ئەوبابەتانەن کە لەسەر ئینتەرنێت بڵاودەکرێتەوە وەك ڕۆژنامەیەکی چاپکراو وایە

---

[1] جێرمی هارس ,سۆشیال میدیا و کۆمنیکەیشن,چاپی دووەم,نیویۆرك, ساڵی چاپ ٢٠١٨ , بەشی یەکەم,ل ٩

[2] Econsultancy.com/what-is-social-media-here لەبەرواری ٢\١\٢٠١٩

لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر مۆبایلی زیرەك کە تابلۆ ودەنگ و وێنەی جولاو دەگرێتەوە [1]

جـان بـۆرگ و تۆمـاس پۆیـل نووسـەرانی کتـێبی The Sage Handbook of Social Media پێیان وایە کە سۆشیال میدیا یـان تۆرەکۆمەلایەتیـەکان بریتیـە لـە پڕبەکارهێنـەرترین ڕێگـا بـۆ ناسـاندنی راو بۆچـوون و کۆمنیکەیشـن لەرێگـەی پەخشـی ئینتەرنێتەوە [2].

توێـژەر پـێ وایـە تۆرەکۆمەلایەتیـەکان : هـەموو ئـەو بۆشـاییە ئەلکترۆنیانەدەگرێتـەوە کـە لەڕێگـەی بـەکارهێنانی ئینتەرنێتـەوە دەتوانرێت بەکاربهێنرێن بۆ ئالوگۆڕی زانیاری و داتـا کـە توانیویـەتی سـنوری خێراییـەکان و ژمـارەی بەشـداربووان لـەکاتێکی زۆر کـەم ببەزێنێت و ببن بە پێگە وسەرچـاوەی چـەندین زانیـاری جـۆراو جـۆر لەسەر ئاستی جیهاندا.

هـەروەها بۆهـەموو بابەتـە زانسـتیەکان وەك (میدیا ,تەندروسـتی سیاسـی , ئـابوری , سـەربازی , کۆمەلایـەتی , وەرزشـی , منـدالان

[1] چرۆ شەهاب لە ئەرشیفی رۆژنامەی کوردستانی نوێ

[2] جان بۆرگ ,تۆماس پۆیل ,سۆشیال میدیا کتێبە ژیرەکە,لەندەن ,سالی چاپ ٢٠١٨ , ل ٤٧

ژنـــان , پرســـه نەتەوایەتیـــەکان , بابەتـــە ئاینیـــەکان , زانســـتی تەکنـــەلۆژیای کۆمپیوتـــەری , سیســـتمی بانـــك ) چـــەندین بـــواری تـــر تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بەکاردەهێنن بۆ گەیاندنی پەیامەکانیان پاشان ئاراســـتەکردنی پـــەیام بـــە دیـــاری کـــراوی بۆهـــەر بابـــەتێك گـــروپ و دەســـتەیەکی جیـــاواز و پـــەیامی جیـــاواز و کـــات و شـــوێنی جیـــاواز بەکاردەهێندرێت .

هەروەها توێژەر پێی وایە لەگەڵ ئەوەی کە تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان زۆر بە بەربڵاوی بەکاردەهێندرێن و چەندین پـرۆژەی بـاش و تێروتەسـەل لەرێگەی تۆڕەکانەوە جێ بەجێ کراوە , وەلێ نابێـت لایـەنی خـراپ و کاریگەریە ئابوری و تەندروستی و کـات کـوژی ئـەم تۆڕانـەمان لـەبیر بچێت , چونکە توێژینەوە زانسـتیەکانی ئـەم بـوارە دەریخسـتوە کـە لەگـەڵ هەمووباشـیەکانی ئینتـەرنێت و تـۆڕی کۆمەڵایـەتی و پێگـە و ســـایتەئەلیکترۆنیەکان ,چـــەندین کـــارلێکی نـــەرێنی و خراپـــی لێکەوتۆتـەوە ,هـەروەها لـەڕووی مێژووییـەوە ئینتـەرنێت بەچـەندین ســـاڵ بـــەر لـــە پەیـــدابوونی تۆڕەکۆمەڵایەتیـــەکان دروســـت بـــووە لەبەرئەوە بەدایکی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان هەژماردەکرێت .

## لایەنی مێژوویی تۆرە کۆمەڵایەتیەکان :

کۆمـــەڵگا هاوچـــەرخەکان شۆڕشـــی زانـــین و زانیارییـــەکانیان بـــەخۆوەبینیوە. ڕۆڵـــی ئـــەم زانـــین و زانیارییانـــەیش لـــەم چـــەند ســاڵە کەمــەی ڕابــردودا، بەرادەیــەك بەرزبووەتــەوە، کــە دەکــرێ لەگەڵیــدا بڵــێین ئــەوەی لــەم چــەند ســاڵەی دواییــدا لەزانســت و زانــین کەڵەکــەبوون، لەســەرووی ئــەو زانســت و زانیارییانەوەیــە کـــە مرۆڤایـــەتیی لـــەماوەی هـــەزاران ســـاڵدا پێیگەشـــتووە کۆمـــەڵگای هاوچـــەرخ لـــە کۆتـــایی ســـەدەی بیســـتەمدا گەشــەکردنی خێــرای لــە تــەواوی لایەنــەکانی ژیــانی ئــابوریی و سیاســیی و تەکنەلۆژییــدا بــەخۆوە بینــوە، بەتایبــەتی لــە بــواری پەیوەنــدیکردن و میــدیادا، بــەجۆرێ کــە کۆمپیوتــەر و مانگــە دەســـتکردەکان و تۆڕەکـــانی زانیـــاریی مـــۆدێرن (ئینتـــەرنێت) ڕۆڵــی گرنگیــان گێــڕاوە لــە گواســتنەوەی زانــین و زانیارییــەکان جیهــانی ئــەمرۆ لەســایەی ئــەم گەشــەکردنانەی تەکنــەلۆژیادا بوەتــە "گونــدێکی بچــکۆلە"، هــەر شــتێك لەهــەر کۆمەڵگایەکــدا

روبــدات، لــە ســاتەوەختی رودانیــدا، بــەدەنگ و وێنــە بــۆ تــەواوی کۆمەڵگاکان دەگوێزرێتەوە[1].

یەکــەمین تــۆڕی کۆمەڵایــەتی لەســەر ئاســتی کەســی لــە ویلایــە یەکگرتوەکانی ئـەمریکا لەسـاڵی ١٩٩٥ لەلایـەن خوێنـدکارێکی زانکـۆ بەمەسـتی بـەردەوامی پەیوەنـدی لەگـەڵ هاورێکـانی دروسـت کـرا و توانیـان پەیوەندیـەکانیان بـرەو پـێ بـدەن لـەژێرناوی( CLASS MATES)بـەدیاری کـراوی لەلایەن(رانـدی کۆنرادس)لەسـاڵی ١٩٩٥ دروستکرا, دواترئەم جۆرە پێگە یان تۆڕی پەیوەندیـە کۆمەڵایەتیانـە زیـاتر گەشـەی کـرد و چـەندین کەسـی تـری سـەرقاڵکرد بەخۆیـەوە هەوڵی چەند کەسێکی تر خرایە بواری جێ بەجێکردن تاوەکوو تـوانرا پێگەی ئەلیکترۆنی (SIX DEGREES) لەلایەن(ئەندرۆ وایـەنریتش) دامەزرا. لەساڵی ١٩٩٧ کە ئەم پێگەیـە بـوو بەناوەنـدێکی گـرنگ بـۆ ئـاڵوگۆری بـیر وبۆچـوون و زانیاریـەکان لەویلایەتـە یـەکگرتوەکانی ئـــەمریکا, هـــەروەها ســـەرەتایەك بـــوو بـــۆ کردنـــەوەی تـــۆرە کۆمەڵایەتیـەکان بـەرووی جیهانـدا کـە هـەر لەوکاتـەدا تـوانرا نامـەی ئەلیکترۆنی و فـایلی تایبـەتی و گشـتی ئـاڵوگۆر بکـرێن ,هـەموو ئـەو

[1] د.محمد علی بدوی , لێکۆڵینەوەی سۆسیۆ مێدیایی , و.مەم بورهان قانع , چاپی یەکەم, چاپخانەی پیرەمێرد ٢٠١٤ , سلێمانی لاپەرە ٩٥

هەنگاوانــە بــوون بەســەرەتایەك كــە كۆمــەڵێك پێگــەی ئــەلیكترۆنی دروســـت بكـــرێن وەك پێگـــەی ( ASIANACAVENE) و (BACKPLANET.COM) پاشان هەنگاوی دروست كردنـی وێـب (WEB) بەشێوەیەكی سەرەتایی .[1]

پاشان بەشێوەی یەك لەدوای یەك چـەندین پێگـە و وێبـی تـر لەسـەر ئاستی جیهان دروست كـران لەوانـە (lIVELOURNAL) هـەروەها (CY WORLD ) لەكۆریا و لەلایـەن ( SKY telecom) دامـەزرا دواتر پێگەی (FRIENSTER) لەساڵی (٢٠٠٢) و لەلایەن (جۆناسـان ئەبرامس) دامەزرا و چەندین پێگەو سایتی تر سـەری هەڵدا كـە وردە وردە ژمارەی بەكارهێنەرانیان زیادی كرد .[2]

دواتر لەساڵی ٢٠٠٣ تۆڕی (MYSPACE) لەلایەن (بـراد گرینسـپان) دامــەزرا وپاشــان فــەیس بــوك (FACEBOOK) لــە ســاڵی ٢٠٠٤ كەلەسەرتادا تەنها تایبـەت بـوو بەخوێنـدكاران پاشـان لەسـاڵی ٢٠٠٥ بەدواوە بڵاوبۆیەوە بەناو خەڵكیدا و دواتریش هەرلەوسـاڵەدا سـایتی (YOUTUBE) دەركەوت و لەساڵی ٢٠٠٦ تویتەریش دروست كرا .

---

[1] محمد عبدالله كەلاری ,جیهانگیری میدیا , چاپخانەی خانی , دهۆك , چاپی یەكەم, ساڵی ٢٠٠٩ , ل ١٤٠

[2] غزال مریم,شعوبی نورالهدی, تأثیرمواقع التواصل الاجتماعی علی تنمیة الوعی السیاسی الدی الطالبة الجامعین, ( رسالة ماجستر) عمان ,جامعة قاصدی مرباح ,كلیة العلوم الانسانیة , قسم الاعلام والاتصال منشور سالی٢٠١٤,ل١٧

لەساڵی ٢٠١٠ یەکەم ڤێرژنی تۆری کۆمەڵایەتی ئینستا گرام دروست کرا (INSTAGRAM) کەیەکێك لەوتایبەتیمەندیانەی هەیەتی بریتیە لە دانان و ناردنی ڤیدیۆ بۆ کەسی بەرامبەر بۆماوەی (٦٠) چرکە و لەئێستاشدا ژمارەی بەکارهێنەرانیان بەردەوام ڕوو لەزیاد بوونە ئەمەش وەك بەشێك لەپێداویستی و پڕکەرەوەی بۆشایی میدیایی بۆ وەرگر هەژمار دەکرێت [1]

بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆر تۆر هەیە :

یەکەم: تۆڕە خۆجێییەکان (Local Area Network)

ئەم جۆرە تۆڕە ئەم تۆڕانە دەگرێتەوە کە تیایدا بەهۆی کۆمپیوتەری بەستراو بە تەلەوە, کە کۆمپیوتەرەکان لای یەکەوەن لەیەك شوێن .

دووەم : تۆڕەناوخۆیەکان ( Wan Area Network)

بریتیە لە بەستنەوەی دووان یان زیاتر لە تۆڕە ناوخۆییەکان لەگەڵ یەکتر کە بەستراونەتەوە لەڕێگەی هێڵی تەلەفون یان مانگەدەستکردەکان . [2]

---

[1] سیاوەش گۆدەرزی , پێشوەچوونە میدیایەکان, چاپخانەی ئاراس , هەولێر , ساڵی ٢٠١٢ ل ١٣٩

٢ بەهادین احمد , و. رابەر رشید ,هەمان سەرچاوەی پێشوو , ل ٤٦

## میدیای ئەلیکترۆنی لە هەرێمی کوردستانی عێراق :

لەگەڵ ئەو گۆڕانە بەرچاوەی لەسەردەمی شۆڕشی زانیاری وپێشکەوتنی تەکنەلۆژیای گەیاندن هاتۆتەئاراوە,بۆتە هۆی ئەوەی کە ملیۆنان کەس لەجیهاندا پەیوەست بن بە بەکارهێنانی تازەترین شێوازی ئامرازی پەیوەندی کردنی سەردەم لەسەرووهەمووشیانەوە تۆڕی ئینتەرنێت ,پاش ئەویش ڕایەڵەکانی تری پەیوەندی کردنی مرۆیی لەجیهاندا کە ڕۆژانە لە فراوان بووندایە کەهەموو ئەوانە هۆکارێکن بۆئەوەی زانایان و پسپۆڕانی ئەو بوارە بەگرنگیەکی زۆرەوە لێی بڕوانن.[1]

کەواتە ئەمە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەخات کە بریتیەلەوەی بابەتی ئەلیکترۆنی یان تۆڕی کۆمەڵایەتی جیاواز لە رۆژنامەی تەقلیدی تەنها لەسنوری سودبینین لەهەستی مرۆڤێکەوە قەتیس نەکراوە بەڵکو بەهۆی خزمەتگوزاریە زۆرەکانیەوە وەرگر دەتوانێت

[1] علی عبدالرحمن ,هونەری کارامەیی کارکردن لە رادیۆ و تەلەفزیۆندا , و. کاروان محمد, چاپخانەی موکوریانی , هەولێر , چاپی یەکەم,٢٠١٣, ل ١٤٥.

لەرێگـەی ئـەم تۆڕانـەوە بەهـەموو هەسـتەکانی چـێژ وەرگرێـت و بەشداری بکات لەهەر پرۆسەیەکی میدیایی[١]

هەروەها لەبەر کاریگەریەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان جگەلەکۆمپیوتەر بەکارهێنـەرانی دەتـوانن موبایـل و ئایپـاد و ئـامێرە زیرەکـەکان بەکاربهێنن , ئەمەش وەك لایەنێك ئیش لەسـەر ئـەوەکراوە تـاوەکوو لایەنی رۆحی و خۆشدەستی و ئاسانی بەکارهێنان فەراهەم بێـت, بـۆ نموونە لەدەرئەنجامی توێژینـەوەکان لەهـەرێمی کوردسـتان بۆسـاڵی ٢٠١٩ دەریدەخـەن کـە رێـژەی ٣٠٪ ی بەکارهێنـەران موبایـل بـەکاردەهێنن ئەمـەش پشتراسـتی باسـەکەدەکات کەلەرێگـەی مۆبایلەوە هەستەکان جوانتر و خۆشتر دەردەکەون .[٢]

هەرچـی دەربـارەی میـدیای ئەلیکترۆنیـە لەهـەرێمی کوردسـتاندا ئەگـەر چـی مێژوویـەکی کـۆنی نیە ,بـەڵام زۆر بـەخێرایی توانیویـەتی

---

[١] د.هێرش رسول ,ئیتیك و یاسا لەمیدیای کوردیدا , چەند وتارێك دەربارەی میدیای کوردی چاپخانەی سەردەم,سلێمانی ,چاپی یەکەم, ل ٢٠٢.

[٢] د.شێرکۆ جبارمحمد , د. هةذار محمد جلال , الاستخدام مواقع التواصل الاجتماعی وانكعاساتها علی القیم الاجتماعیة لدی الطلاب جامعات اقلیم كردستان – العراق , الدراسة میدانیة , جامعة بولیتكنیك السلیمانیة , ل ١٥

هاوشـانی پێشـکەوتنە تەکنەلۆژیـەکانی تـر هـەنگاوی کـەم تـازۆر بنێت,لەبـەر ئـەوەی میـدیای کـوردی کاتێـك لەبـەردەم ئـەو گۆڕانـە خێرایەدا خۆی بینیـەوە لـەهاتنی مـانگی دەسـت کـرد و ئینتـەنێت و پەخشی ئاسمانی ئەمەبووە شەپۆلێکی گرنگـی ناسـاندنی ئینتـەرنێت وتۆڕەکۆمەلآیەتیەکان بۆ تەواوی کوردستان ومیدیای کوردی . [1]

بۆیە لەگـەڵ ئـەوەی لەدیـد و بۆچـوونی توێـژەران و شـارەزایانی ئەم بوارەدا سەلمێندراوە کە تاکی کوردی تاکوو ئێستا نەی توانیـوە بەشـێوەیەکی تەندروسـت مامەڵـە لەگـەڵ تورەکۆمەلآیەتیـەکان و ئینتـەنێت بکـات ,بـەلآم لەئێسـتادا میـدیای ئـەلیکترۆنی و هێڵـەکانی ئینتـەرنێت بۆتەپێویسـتیەکی گـرنگ لەسـەرجەم کایـە سیاسـی و کۆمەلآیـەتی و یەکـە کارگێڕیـەکان هـەروەها بەکارهێنـەرانی سـات بەسات لەزیادبوون وپێشکەوتن و تازەگەریدایە [2]

[1] عبدالخالق ابراهیم ,میدیای کوردی لەسەردەمی ئاسمانە کراوەکاندا دەروازەیەك بۆ ناساندنی رۆڵ و ئامرازەکانی تەکنەلۆژیای ژمارەیی و میدیای نویێ, چاپخانەی موکریانی ,هەولێر, چاپی یەکەم ساڵی ٢٠١٤ , ل ١٦٤.

[2] محمد عبدالله کەلاری ,هەمان سەرچاوەی پێشوو , ل ٢٤١.

شێوازەکانی ناتەندروست بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان لای هەر کەس بۆجۆرێك رەنگدانەوەی خۆی هەیە هەم لە دروست کردنی ئەکاونتی ساختەوە تاکوو نوسینی کۆمێنت لایککردنی بێ مانا ئەوەی دەرکەوتوە تاکوو ساڵی ٢٠١٢بەپێی ئاماری نافەرمی ژمارەی بەکارهێنەرانی فەیسبووك نزیکەی (٨٤٥٠٠٠٠٠)هەشت سەت و چل وپێنچ ملیۆن کەسە لەوژمارەیەشەدا نزیکەی پەنجا ملیۆن کەسی لەولاتەعەرەبیەکاندان, لەپاڵ هەموو ئەوانەشدا بەپێی ئاماری عێراقی نزیکە ٣,٢٨٨,٥٨٠ کەس بەکارهێنەری فەیس بوك هەن تەنها فەیسبووك هەروەها بە پێی ریزبەندیەکان عێراق لە ریزی پەنجاهەمین ولاتە کە بەکارهێنەری فەیس بوك و تۆری کۆمەڵایەتیە [1]

ئێمەش وەك میللەتی کورد بەوپێەی کە لە عەرەب و فارس نزیکین بەشێك لەداتاکان ئێمەی میللەتی کوردیش دەگرێتەوە بۆیە بەپێی ئامار و سەرچاوە و توێژینەوەکان دەردەکەوێت کە تاکی کورد بەشێکی زۆری هێندەی بۆکات کوشتن خەریکی بەکارهێنانی ئەم تۆڕانە دەبێت هێندە بۆ سوود وەرگرتن بەکاری ناهێنن ,بەمانایەکی

[1] میدیای کۆمەڵایەتی,تاژان دڵشاد,بەریتانیا , ٢٠١٣, ل ١٦

تر ئەم تۆڕەكۆمەڵایەتیانە بۆئەوەی كەلەپێناویدا دروست كراون لای میللەتی كورد بەكارناهێنرێن لەبری ئەوەی بۆ پەیوەندی كۆمەڵایەتی و بەستنەوەی تاكەكان بەكاربهێنرێت ,بۆدژایەتی و دوژمنایەتی و یەكلاكردنەوەی حساباتی شەڕی كۆنە قین بەكاری دەهێنن ,لەپاڵ ئەوانەشدا ئێستا شەڕی گەورەی لایەنگرانی حیزب و لایەنە سیاسیەكان لەفەیسبووك و تۆڕەكۆمەڵایەتیەكاندا بەتەواوەتی رەنگی داوەتەوە ,هەندێك جاریش ئەم هەڵوێستە دەكەوێتە سەر ئەرزی واقیع و بەرپرسان و لایەنگرانیان وەڵامی توندی یەكتر دەدەنەوە لەسەر یەك پۆست یان كۆمێنت.[1]

هەرچی دەربارەی ژمارەی ئامارەی تۆڕ و سایت و پێگە ئەلیكترۆنیەكانە لەهەرێمی كوردستاندا بەوردی نازانرێت بەڵام تۆڕەكۆمەڵایەتیەكان بەهەمان شێوەی میدیای كلاسیك شمشێرێكی دوو سەرە چونكە لەڕێگەی تۆڕەكۆمەڵایەتیەكان دەیان و سەدان پرۆژەی خێرخوازی و ئاشتەوایی و مرۆیی و كۆكردنەوەی كۆمەك و

[1] محمد علی وەلی , راگەیاندن ,كۆمەڵە وتار , چاپخانەی رۆژهەلاَت, هەولێر, چاپی یەكەم , ساڵی چاپ ٢٠١٣ , ل ١٢٨.

دروست کردنی کۆدەنگی و ڕاپرسی وتەنانەت پرۆسـەی هاوسـەرگیری و دۆزینەوەی کەسی ون بـوو ئاشـکراکردنی کەسـانی ئەشـکەنجەدراو دروسـت کردنـی ڕای گشـتی لەسـەر پرسـی جـۆراو جـۆر لەهـەرێمی کوردستاندا کاری لەسەر کراوە ئەمە ڕووە باش و جوانەکەی میـدیای ئـەلیکترۆنی یـان سۆشـیال میدیایـە , بەپێچـەوانە دیـوی دووەمـی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان لەهەریمی کوردستان کە بەکارهێنەرانی بەسوود بینین لێی دەیان کاری نەشیاو نارەوایـان پـێ ئـەنجام داوە ئـەوەش خۆی لەبازنەی ناوزڕانـدن و نـامووس هەرەشـەکردن و بڵاوکردنـەوەی زانیاری ناڕاست و بڵاوکردنەوەی ڤیـدیۆی نەشـیاو وزیندووکردنـەوەی رۆحـی عەشـایەری و چـەندین جـۆری تـر لـە لایەنـە خراپـەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان دەخاتەبەر باس .

## یەکەمینەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان لە ساڵی ٢٠١٨




١. تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بوك
٢. پێگەی یوتوب
٣. تۆڕی کۆمەڵایەتی تویتەر
٤. تۆڕی کۆمەڵایەتی ئینستاگرام




٥.  تۆڕی کۆمەڵایەتی لینکلیدن

٦.  تۆڕی کۆمەڵایەتی گۆگڵ پلەس

٧.  تۆڕی کۆمەڵایەتی پینترێست

٨.  تۆڕی کۆمەڵایەتی مای سپەیس

٩.  تۆڕی کۆمەڵایەتی تومپلەر

١٠. تۆڕی کۆمەڵایەتی فیلکەر

١١. تۆڕی کۆمەڵایەتی گود ریدیس

١٢. تۆڕی کۆمەڵایەتی ئۆردکدت

١٣. تۆڕی کۆمەڵایەتی واتس ئەپ

١٤. تۆڕی کۆمەڵایەتی سناپ چات

١٥. تۆڕی کۆمەڵایەتی ڤایبەر

١٦. تۆڕی کۆمەڵایەتی دیك

١٧. تۆڕی کۆمەڵایەتی کورا

١٨. تۆڕی کۆمەڵایەتی ڤین

١٩. تۆڕی کۆمەڵایەتی پریسکۆپ

٢٠. تۆڕی کۆمەڵایەتی بیزوگار

٢١. تۆڕی کۆمەڵایەتی ریدیت

٢٢.تۆڕی کۆمەڵایەتی دیلیوشز

٢٣.تۆڕی کۆمەڵایەتی ستەمبلس ئۆوپن [1]

## تایبەتمەندیەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان :

١- تۆرەکۆمەڵایەتیەکان شوناسی کەسەکان تۆماردەکات و دەیپارێزێت : وەك هەنگاوی یەکەم لە چوونە ناو تۆرەکانی ئینتەرنێت, یان بەشداری کردن لەو تۆڕانە بەشی پێناس یان شوێنی تۆمارکردنی زانیاری کەسیەکان هەیە,ئەمەش جۆرێك لە شوناس دەدات بە کەسانی تر کە هاورێیەتی لەگەڵ دەکەن .

٢- تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان توانایەکی ئێجگار باشیان هەیە لە ئەرشیف کردنی زانیاریەکان .

٣- تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان توانیان میکانیزمێکی نوێ بهێننە کایەوە بۆ جۆر و قەبارەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان هەم لەسەر ئاستی تاك هەم لە ئاستی کۆمەڵگادا .

٤- ئاسانی لەبەکارهێنانی فاکتەر و تایبەتمەندیەکی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانە کە هەرکەسێك تەنها بە بوونی توانایەکی کەم دەتوانێت بەکاریان بهێنێت .

---

[1] http://www.rowadalaamal.com لە ٢٥\١\٢٠١٩

٥- بەکارهێنـەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان بەشـێوەیەکی زۆر ئاشـکرا کارلێك دەکەن وەك نێرەر و وەرگر کە بەشدارن لەکایەی سیاسی و تەندروستی .

٦- تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان دەروازەیـەکی فـراوان و بـێ سانسـۆر و بـێ سـنوری خسـتە بـەردەم بەکارهێنـەران و رۆژنامونووسـان , تـاك دەتوانێت بە بوونی ئاوها شوێنێك زیـاتر بـیر و ڕای خـۆی پیشـان بدات .

٧- فراوان بینی لەبەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان کە توانی زۆربەی جومگوکـانی کۆمـەڵگا بەیەکـەوە ببەسـتێت و خۆشـی ببێـت بەسـەنتەری هـەموویان بۆنموونـە لـەبوارەکانی (تەندروسـتی سیاسی , وەرزشی , ئابووری , بازاڕگەری و گەشـەپێدانی مرۆیـی بازرگانی , هۆشیاری گشـتی , هـەلی کـار , رێکـلام , بلاّوکردنـەوە بەبازارکردن ..هتد ).

٨ تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان لەبـەر خێرایـی لەگەیانـدنی زانیـار و داتـا توانیویەتی کاریگەری بێ سنوری لەسەر بەکارهێنەرانی هەبێت .

٩ ناوەندێکی گرنگ و هۆشیار و چالاکی ئالّو گۆڕی زانیاریەکانە .

١٠ بۆتە هاوكاریێكی گرنگی هەر بەكارهێنەرێكی بەمەبەستی بە ئاگابوون لەهەر گۆڕانێكی ناوخۆ و دەرەكی لەسەر ئاستی جیهان بەشێوەیەكی گشتی .[١]

١١ تۆڕەكۆمەلأیەتیەكان توانیویەتی پانتایی شوێن و كات و سانسۆر و سنورەكان تێك بشكێنێت .

١٢ تایبەتمەندیەكی تری تۆڕەكۆمەلأیەتەكان هەرزانی لەنرخ و ئاسانی لە بەكارهێنان و دەست خستنیەتی [٢]

١٣ تۆڕەكۆمەلأیەتەكان جیهانگیری راستەقینەی هێناوەتەوە كایەوە .

١٤ تۆڕەكۆمەلأیەتیەكان جیاوازی نەژادی و كلتوری نەهێشت .

١٥ وەك كە لەخالّەكانی سەرەوەدا ئاماژەمان پێدا تۆرەكۆمەلأیەتیەكان توانای ئەرشیف كردنی زانیاری و داتایان هەیە ,لەگەلّ ئەوەشدا لابردن یان سرینەوەی داتاكان یان هەر گۆڕانێك لەو پەیامەی كە بلأو كراوەتەوە.

١٧بەكارهێنەری تۆڕەكان بلأویان كردۆتەوە ,تۆڕەكۆمەلأیەتیەكان ئەوتایبەتمەندیانەی بۆفەراهەم كردوون كە بەئاسانی دەتوانن

---

[١] مريم نريمان نومار , استخدام مواقع شبكات الإجتماعية وتأثير فى العلاقات الإجتماعية , جزائير , جامعة حاج الخضر,كلية الاعلام والاتصال ,( رسالة ماجستر), ٢٠١٢غيرمنشور , ل ٥٣

[٢] نەعیم بەدیعی , رۆژنامەوانی ئەلیكترۆنی , و. كارزان محمد , چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم , سلێمانی ,سالّی چاپ , ٢٠٠٠ , ل ١٦

بیگۆڕن یان لای بەن یان بەرواری پەخش یان شوێنەکەی یان وێنە
و دەنگ بەئارەزووی نێرەر گۆڕانکاری بەسەردا بهێنرێت [1]

## لێکەوتە خراپەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان :

وەك ئە وەی زۆرجار زانیاری و داتاکانی ئە م میدیایە لە روی زانستی و راستگۆییە وە جێگە ی متمانە نین, چو نکە رۆژانە چە ندان سایت و پێگە ی ئە لیکترۆنی و کە ناڵی جۆراو جۆری ساختە و دوور لە متمانە دروست دە کرێن و زانیاری و داتای جۆراو جۆر پە خش و بلاَو دە کە نەوە ، بە م پێە میدیای ئە لیکترۆنی بە تایبە ت ئینتە رنێت و سایت و پێگە و لاپە ڕە کانی هە ندێك جار وە ك ئامراز گە لێکی بێسە رو بە ری و هە ڕە مە کی دێنە بە رچاو کە کۆنترۆڵ کردن و رێکخستن و ئاراستە کردنیان ئاسان نا بێت.

ئە مە وای کردوە ئە وکە سانە ی زیاتر پشت بە میدیای ئە لیکترۆنی دە بە ستن بە دو دلّی و گو مانە وە بڕواننە زانیاری و داتاکانی میدیای ئە لیکترۆنی ئە م هە لو مە رجە ش زیاتر لەوە وە

[1] محمد عبدالله کەلاری ,دەزگاو ئامرازە جیهانگیریە میدیاییەکان,گۆڤاری رۆژنامەنووس , سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان ,ژمارە ,٢٠لە,٢٠١٠,ل ١٨٤

سه رچاوەی گرتووە کە هەندێك جار خاوەن و هە ڵسو ڕێنە رانی ئەم میدیایە نادیار و نە ناسراو بن .

یان لەپێگەی دامەزاوەو کە سانی فەرمی وکەسایەتی مەعنەوی یان ڕۆژنامەنوسی پرۆفیشناڵی بواری راگەیاندن و ڕۆژنامە گە ری نین.

میدیای ئە لیکترۆنی ناتوانێت هەموو کات ڕوبە روی یاسا بکرێتەوە ئە گەر لەرێگەی ئینتەرنێتەوە کارێکی نایاسایی ئەنجامدراو زیانی بە کە سایە تی کە سێك گە یاند و ناوی زراند.ئەوا ئەو یاسایانەی لەو وڵاتانەی دونیا دانراون ڕون نین و ناتوانرێت بە سە رهە مو میدیا ئە لیکترۆنیە کاندا بگشتینرێت ,بە هۆی جیاوازی ژینگە ی کۆمەڵایە تی ویاسای وڵاتانەوە, هەروەها ناتوانرێت تاك تاکی خەڵك وکەسایەتیەکانی ولاتێك یان ناوچەیەك لە باهۆزی تە شهیر پێکردن و ناوزاندن و سوکایەتی پێکردن بپارێزرێت، زۆرکات ناتوانرێت شوێنی تۆمەتبارێك کە تە شهیر دە کات دیاری بکرێت ، یان زۆرکات تۆمەتبار ناوی خوازراو بۆ خۆی بە کاردەهێنێت ، یاخوود ئەگەر سەرچاوەی تەشهیر یان تاوانبار دۆزرایەوەو لە وڵاتێکی تربێت چۆن

و بەكام یاسا مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت , ئەمانە دەرخەری ئەو ڕاستیەن كە تۆڕەكۆمەڵایەتیەكان ئاسان كۆنترۆڵ ناكرێن .

هەندێك جار لە میدیای ئە لیكترۆنیدا ستەم لە مافی نوسەر یان خاوەنی بیرۆكە دە كرێت , بە یام و بابە ت كۆپی پە یست دە كرێت و ڕەچاوی مافی خاوەندارێتی كە متر دە كرێت، وە هە ندێك جار تاوانی چەتەیی و دزی ئە لیكترۆنی دە كرێت ، وە ك خاڵی كردنی ژمارە بانكیە كان و هاككردنی پێگە و ئە كاونتە كان و بردنی بە ڵگە نامە گرنگ و هە ستیارە كان...هتد. ١

## جۆرەكانی تۆڕەكۆمەڵایەتیەكان :

## كلاس مەیت : Classmates

بەیەكەمین تۆڕی كۆمەڵایەتی دادەنرێت لە مێژوودا كە لە ١٧ی نۆڤەمبەری ١٩٩٥ لەلایەن ڕاندی كۆنرادس دامەزرا , وەك بەشێكی زۆر لە تۆڕەكۆمەڵایەتیەكان خوێندكارانی زانكۆ و پەیمانگاكان بۆ برەودان بەپەیوەندیەكانیان بەكاریان هێناوە,دواتر ناوەكەی گۆڕا بۆ (Memory lane) پاشان ئەم ناوە وەك براندێكی بازرگانی

---

١ محمد علی ولی ,هەمان سەرچاوەی پێشوو , ل ١٨١

دەرکەوت,کلاس مەیت لەسەرەتای دروست بوونیەوە وەك پێگەیەکی گرنگ بەکارهێنەری تایبەتی خۆی هەبووە,بەتایبەت کە مۆرکی بازرگانی وەرگرت, بۆیەبەپێی داتاوئامارەکانی ساڵی ٢٠١٧ دەرکەوتووە بەنزیکی (٧٠) ملیۆن بەکارهێنەری هەیە.

## سکس دیگری : sixdegree

یەکێکی تر لەداهێنانە کۆمەڵایەتیەکان کە لە ساڵی ١٩٩٧ دامەزرا بریتیە لە sixdegree.com رێگەی بە بەکارهێنەرانی داپرۆفایلی خۆیان دابمەزرێنن , ویستی هاودەمەکانی خۆیان دیاری بکەن , ئەم خزمەتگوزارییانە لە ساڵی ١٩٩٨ خرایە بواری جێبەجێکردن کە رێگەی دەدا بەکارهێنەرانی بتوانن لە لیستێکدا ناوی یەکتر ببینن sixdegree وا بانگەشەی بۆخۆی دەکرد کە ئامێرێکە بۆ یارمەتیدانی بەکارهێنەران تاوەکوو نامە بۆ یەکتر بنێرن و بتوانن پەیوەندی ببەستن , ئەم سایتە وەك ئەوەی ملیۆنان بەکارهێنەری لەخۆی کۆکردەوە , بەلاّم بەردەوامبونی بەخۆیەوە نەبینی و نەیتوانی بزنسی بەردەوام بۆخۆی برەخسێنێت , لەبەرئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٠ دا ئەم خزمەتگوزارییە گەشتە کۆتایی, لە ئاوڕدانەوەیەك بەرەو دواوە دەگەینە ئەو راستیەی کە هۆکاری نەمان یان سست

بوونی ئەم سایتە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەر لەوادەی خۆی هاتە کایەوە .

## فرێندستەر : Friendster

دوای نەمانی سایتی sixdegree سایتی فریندستەر دروست بوو لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ,ئەم سایتە لەرێگەی ئۆنلاین بازنەیەکی هاورێییەتی گەورەی دروستکرد کە توانی نزیک (٣) ملیۆن بەشدار بوو لەخۆی کۆبکاتەوە تەنها لەماوەی یەك سالی کارکردنی بەلام ئەوەی جێی بایەخ بێت ئەوەیە کە ئەم سایتە زۆر سودی لەوهۆکارانە بینی کە ببونە هۆی نەمانی سایتی sixdegree بۆمانەوەی خۆی .

## لینکلیدین : Linkedln

دوابەدوای ئەو پێگە ئەلیکترۆنیانەی کە باسمان کرد لەسالی ٢٠٠٣ تۆڕی کۆمەلایەتی لینکدین دامەزرا کە بەیەکێك لە بەناوبانگترین تۆڕەکۆمەلایەتیەکان دادەنرێت چونکە توانی نزیکەی (٧٥) ملیۆن بەشداربوو لای خۆی تۆمار بکات , دواتر وردە وردە بەکارهێنەران توانیان گروپ دروست بکەن و چەندین هەلی کار و پرۆژە و بزنسی گرنگی تیا ئەنجام درا, ئەمە دوای ئەوەی کە لەلایەن سایتەکەوە

چەند خزمەتگوزاری تر خرایە بەردەستی بەکارهێنەرانی لەوانە (سەکۆی پرسیار و وەڵام , هەلی کار , دامەزراند ) . هتد .

## مای سپەیس : my space

دامەزراندنی مای سپەیس لەلایەن (برادگرینسپان) ەوە ,بوو لەساڵی ٢٠٠٣ , مای سپەیس میدیایەکی کۆمەڵایەتی ترە لەو تۆڕانەی کە دروست بوون , کە بەتایبەت لەناوگەنجاندا بەکاردەهێنرا , ئەندامانی ئەم تۆڕە نەگەشتونەتە ئاستی فەیسبووك هەروەها ئەم سایتە بەتایبەتی لە لایەن باندی indic-rock وە برەوی پێدرا , ئەمەش دوای ئەوەی کە دەرگای فریندستەر بەرویاندا داخرا کە هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نەیانتوانی پابەندی مەرجەکانی فرێندستەر بن , مای سپەیس و یوتوب بەگەورەترین شوێن دادەنرێن بۆ گروپی Teanager کەگروپێکی میوزیکین هەرلەوێ ئیش و چالاکیەکانیان پیشان دەدەن .[١]

## دلیشز : Delicious

یەکێکی ترە لە تۆرە کۆمەڵایەتیەکان کە لەساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە ,ئەم تۆڕە زیاتر بۆ گەڕان بەدوای شوێن(Location)

---

[١] تاژان دڵشاد , سۆسیال میدیا و رۆڵی پاراستنی لە کلتور و زمانی کوردیدا , نامەی ماستەر , زانکۆی برادفۆرد , ٢٠١٣

بــەكار دەهێنــدرێت ,هــەروەها هــەواڵ وەك بابــەتێكی گــرنگ تیایــدا بڵاوكراوەتەوە .

## دیگ : Digg

تـۆڕی كۆمەڵایـەتی دیـگ لـە سـاڵی ٢٠٠٤ لەلایـەن (كـیڤن رۆس –ڕۆن گـۆرۆدیزكی – جـەی ئەدرسـۆن – ئـۆوین بریـان ) دروسـتكراوە وەك بەشێك لە تۆڕەكۆمەڵایەتیەكانی تر ڕێگەی بە بەكارهێنەرانی داوە كە وێنە و ڤیدیۆ بڵاوبكەنەوە و شەیری پۆستەكان بكەن .

## تومبلەر : Tumblr

تۆڕێكی كۆمەڵایەتی تێكەڵە لە بابەتی خزمـەتگوزاری و بڵاوكراوەكـان كە لەساڵی ٢٠٠٧ دامەزراوە, ئەو كەسەی كەدەبێت بـە بەكارهێنــەری ئــەم تــۆرە بــە (tumblr bloggers) ناودەبرێــت ,هــەروەها بەكارهێنەر دەتوانێت (وێنـە وڤیـدیۆ, دەنـگ ,لینـك, چـات) ئـاڵوگۆر بكات لەناو ئەم تۆڕەدا .[١]

[١] www.webdesignerdeot.com ٢٠٢٠\٣\٧

## کیك : (Keek)

تـۆڕی کۆمەڵایــەتی کیـك یـەکێکی تــرە لەتۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان کـە بەکارهێنـەرێکی تایبـەتی خـۆی هەیـە ,ئـەم تـۆڕە وەك تایبەتمەنـدی زیاتر بۆ دابەزاندنی گرتـەی ڤیـدیۆیی ماوە کـەم کـە تـاوەکوو (٣٦) چـرکە بـەکاردەهات, بۆیەکـەم جـار ولەسـاڵی ٢٠١١ لەسـەر دەسـتی بەرنامەسـازی کەنـەدی ئیسـرائیلی (ئیسـحاق رایچیك) لەسـەر هێڵـی تەلەفونی جێگیر(کەیبڵ) بـە بـەکارهێنانی کۆمپیوتەردروسـتکرا , کـە یەکێك لەهۆکارەکانی دروستکردنی ئەم تـۆڕە بریتـی بـوو لـەوەی کـە بۆکۆمپانیاکـانی پەیوەنـدی ڕوون بۆیــەوە پەیوەنـدی کۆمەڵایــەتی ئینتــەرنێتی بۆتــە جێــی گرنگــی زۆرێــك لــە خــەڵکی , کیــك بچوککراوەیەکی یوتوب–ە ,بەڵام کیك زیاتر سـەرنجی لەسـەر کورتـە ڤیدیۆیە .[١]

## کیۆکیۆ : QQ

تــۆرێکی کۆمەڵایــەتی کلتــوری جیهانیە,کــە زیــاتر لــە ٨٠ وڵات بەکارهێنەری ئەم تۆڕەن,کەلە بنەڕەتدا لە وڵاتی چین دروست کـراوە ئـەوەی ئــەم تــۆڕە لــە تۆڕەکـانی تــر جیادەکاتــەوە ئەوەیــە کــە تایبەتمەندی وەگێڕانی زمانەکانی تێدایە تاوەکوو بەکارهێنەر بتوانێت

---

[١] بسمة قائد البناء , تويتر والبناء الاجتماعي والثقافي لدى شباب , دار فارس للنشر, الاردن ,٢٠١٤, ل ٥٥

ســوودی لێوەربگرێــت بەتایبــەت بــۆ نووســینی چــات ,هــەروەها خزمەتگوزاری تەلەفوون  نامەی دەنگی و ناردنی وێنــە و ڤیـدۆ لـەناو ئەم تۆڕەدا بوونی هەیە تاکوو ئێستاش بەکارهێنەری هەیـە بـەنزیکی مانگانە (٣٠) ملیۆن بەکارهێنەر .

## کیو زۆن Qzone

یـەکێکی تــرە لــە تۆڕەکۆمەڵایەتیــەکان کــە زیــاتر بــەوە ناســراوە بەکارهێنەر تەنها بۆ وەرگرتنی بیرۆکە و ئەندێشەی فەلسەفی بەکاری دەهێنن ژمارەی بەکارهێنەرانی بەنزیکی (٦٤٠) ملیۆن بەکارهێنەرە.

## بایدو تیدا :Baidu Tieda

تۆڕێکی کۆمەڵایەتی جیهانیـە کـە بەبزوێنـەری دۆزینـەوەی هـەلی کـار ناســراوە, کەبەکارهێنــەر لــە ڕێگــەی بەشــی گــەڕان دەتوانێــت بــۆ دەستخســتنی هــەلی کــار ســوود لــەم تــۆڕە ببینێــت کــە ژمــارەی بەکارهێنەرانی بە نزیکی (٣٠٠) ملیۆن بەکارهێنەرە.

## ئێکس ئێکس کام :XXCOM

ئــەم تــۆڕە یــەکێکی تــرە لــەو تۆڕانــەی کــە بەشــداربوویەکی زۆری لــەدەوری خــۆی کۆکردۆتــەوە تایبەتمەنــدی ئــەم تــۆڕە لەوەدایــە کــە لەساتی دامەزراندنیدا توانیویەتی گروپ چاتی گــەورە دروســت بکــات

بـۆ بەکارهێنــەرانی کــە تــاکوو گروپــی (١٠٠٠٠٠) کەســی , هــەروەها ژمـــــارەی بەکارهێنـــــەرانی بـــــەنزیکی (١٢٢) ملیـــــۆن بەکارهێنەردەخەملێندرێت .

## ڤی کەی :VK

کـە بـە VKontakte یـش ناسـراوە تـۆڕێکی کۆمەلأیـەتی ولأتـی رووســیایە, کــە تایبەتمەنــدی خزمەتگوزاریــەکانی تــەواو نزیکــە لەفەیسبووك ژمارەی بەکارهێنەرانی بەنزیکی بریتیە لە ( ١٠٠) ملیـۆن کەس.

## تارینگا : Taringa

یەکێکـە لـە تۆڕەکۆمەلأیەتیـەکانی دونیـای ئینتـەرنێتی کـە زیـاتر لـە ئەمـــەریکای لاتـــین بەکاردەهێنـــدرێت و ژمـــارەی بەکارهێنـــەرانی نزیك(٧٥) ملیۆن بەکارهێنەرە.

## زە دۆتس : The –Dots

تۆڕێکی کۆمەلأیـەتی بەناوبانگـە کـە لەلایـەن (پیـپ جامیسـۆن) ەوە لەسـالّی٢٠٠٤دروسـتکراوە, تـۆڕێکی بەریتانیـە زیـاتر بـۆ بـرەودان و قســـەکردن دەربـــارەی بازرگـــانی مامەلّـــەو قـــازانج وســـەرمایە بەکاردەهێندرێت ,تایبەتمەندی ئەم تۆڕە لەوەدایە کـە وەك بـازارێکی

سەربەخۆ ناسراوە و بەردەوام مانگانە نزيك (١٠٠) مليۆن بەكارهێنەر بەكاردەهێنن .[١]

## كيوى بۆكس : Kiwi Box

يەكێكى ترە لە تۆڕەكۆمەڵايەتيەكانى ولأتى ئەمريكا, كەزياتر گەنجان بەكارى دەهێنن هەروەها وەك گۆڤارێكى ئينتەرنێتى ناودەبرێت بەومانايەى كە زۆرترين بابەت و پێداويستى زانيارى گەنجان فەراهەم دەبێت لەرێگەى ئەندام بوون لەم تۆڕەدا .

## سكاى رۆك : Skyrock

سكاى رۆك بە ئازادى تۆڕەكۆمەڵايەتيەكان ناسراوە و تۆرێكى فەرەنسيە,بەڵام لەلايەن زۆرێك لە ئينگليزەكان بەكاردەهێندرێت و تەواوى خزمەتگوزاريەئينتەرنێتيەكان تيايدا بەردەستە.

## ماى هێرتج : MyHeritage

تۆڕى كۆمەڵايەتى ماى هێرتج بەپڕبەشدارى ترين تۆڕ هەژماردەكرێت بۆ ئەو كەسانەى خولياى زانينن دەربارەى ڕەچەڵەك و رابردووى خێزانەكانيان,چونكە لەم تۆڕەدا چەندين گروپى خێزانى تۆمار كراون كە تۆڕەكە هاوكارێكە بۆ دۆزينەوەى ئەوكەسانەى كەلەڕووى

[١] د. على على فهمى , هەمان سەرچاوەى پێشوو , ١٠٢

بنەچەوە لەیەک نزیکن, کە بەنزیکی ٤٢ زمان بەکارهێنەر بەکاری دەهێنن, هەروەها نزیکەی (٣٥) ملیۆن خێزان تۆمارکراون لەم تۆڕەکۆمەلأیەتیەدا, هەروەها چەند بنکەیەکی لەولأتانی جیاوازی دونیادا هەیە لەوانە(کالیفۆرنیا , تەلئەبیب, ئۆکرانیا)

## فەنی ئۆرِدای : Funny or Die

تۆڕێکی کۆمەلأیەتیە کە بەوەناسراوە زیاتر بۆ بلأوکردنەوەی ڤیدیۆی کۆمیدی و کات بەسەر بردن بەکاردەهێندرێت, ڤیدیۆی بۆنەو ئاهەنگەکان و بەسەرهاتەکۆمیدیاکان زۆرترین بابەتی بلأوکراوەی ناو ئەم تۆڕەکۆمەلأیەتیەن.

## تیك تۆك : Tik Tok

تیك تۆك یان Douyin یەکێکە لەتازەترین تۆڕەکۆمەلأیەتیەکان کەلەسالّی ٢٠١٦ لەولأتی چین دروستکراوە, تیك تۆك بەوە ناوی دەرکرد کەدەتوانرێت جگەلە بلأوکردنەوەی ڤیدیۆ ,دروستکردن و پێدانی کاریگەری دەنگی و وێنەیی بدات بە گرتەکان, لە داتاکانی سالّی ٢٠٢٠ دا تیك تۆك یەکێکە لە یەکەمینەکانی ناو تۆڕەکۆمەلأیەتەکان,هەروەها تیك تۆك بە نزیکی ٤٠ زمان و

بەبەشـــداری ١٥٠ مليـــۆن بەكارهێنـــەری رۆژانـــە ونزيـــك ٥٠٠ مليـــۆن بەكارهێنەری مانگانە بووە بە بەتۆرێكی كاریگەر و پڕبينەر.[١]

## فەيسبووك :

فەيســـبووك بەيـــەكێك لـــە گـــەورەترين و پـــڕ بەشـــدارترين ژمـــارەی بەشداربووان دادەنرێت لەنێت ۆركدا ,كەلەسەرەتا دا بە تەكنـەلۆژياو تـەكنيكێكی سـەرەتايی دروسـت كـرا, پاشـان بـەرە بـەرە ژمـارەی بەكارهێنەرانی ڕووی لە زياد بوون كـرد بـەپێی سەرچاوەی (قـاموس الاعـــلام والاتصـــال) ( Dictionary of media and communication) فەيســـبووك توانيويـــەتی زۆر بـــەخێرايی هەموو سنورەكان ببڕێت بۆيـە بـەردەوام ژمـارەی بەشـداربووانی ڕوو لەزياد بوونە[٢]

فەيسبووك لە ساڵی ٢٠٠٤ لەلايەن مارك زۆرگ بێـرگ وەك پێگەيـەكی سەرەتايی بۆ برەودان بە هاوڕێيەتی كۆمەڵێك لە خوێنـدكارانی زانكـۆ دروسـت كـرا هـەر ئـەم بيرۆكەيـە وايكـرد پـرۆژەی دروسـت كردنەكـە بكەوێتـــە بـــواری جـــێ بـــەجێ كـــردن پاشـــان چـــەندين بـــەش و

---

[١] www.makewebsitehub.com لە ٢٠٢٠\٣\٧

[٢] عقيد.د.عطا الله بن فهد السرحانى ,توظيف الشبكات التواصل الإجتماعى فى مكافحة الارهاب ,كلية تدريب ,قسم البرامج التدربية, (رسالة دكتورا) ٢٠١٣ , منشور سعودية , ل ٥٥

خزمەتگوزاری و ئۆفەری بۆ زیاد کرا لەگەل زیاد کردنی هەر بڕگەیەك ساڵ لە دوای ساڵ ژمارەی بەکارهێنەرانی ڕووی لەهەڵکشان کرد بەمەش خاوەنەکەی توانی ببێت بە گەنجترین ملیاردێر لەسەر ئاستی جیهاندا .

لەئێستادا فەیسبووك زۆرترین ڕێژەی بەکارهێنەری هەیە لەو ڕێژەیەش پشکی شێر بەر ویلایەتەیەکگرتوەکانی ئەمەریکا دەکەوێت بەپێی ئاماری ساڵی ٢٠١١ فەیسبووك ٨٠٠ ملیۆن بەشدار بووی هەیە کە بەرێژەی ٥٠٪ رۆژانە بەکاری دەهێنن لەیەك چرکەدا لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك ئەو کردە پەیوەندییانە ئەنجام دەدرێت

لەیەك چرکەدا ٥١٠ هەزار کەس کۆمێنت دەنوسێت .

لەیەك چرکەدا ٢٩٣ هەزار کەس دەچێتە ئۆنلاین .

لەیەك چرکەدا ١٦٣ هەزار کەس وێنە بلاودەکرێتەوە .

لەیەك چرکەدا ٣٠ ملیۆن پارچە لەفەیس بوك سەیڤ دەبێت [١]

هەروەها فەیسبووك لەبەر فراوانی خزمەتگوزاریەکان و زۆری ژمارەی بەشداربوانی زۆرترین داتاو ئاماری لەسەر بلاو دەکرێتەوە بەشێکی

[١] Other Zephoria Posts that may be of interest لەبەرواری ٢٠١٩\٢\٦

تــری داتاکــان بــەم جــۆرە ئامــاژە بــە کاریگــەری و هەڵســوکەوتی بەکارهێنەرانی دەکەن ئاماری ٢٠١٧

رێژەی ٥٠٪ ی بەشداربوانی فەیسبووك تەمـەنیان لـەنێوان ١٨ بـۆ ٣٤ساڵیدایە .

رێژەی ٢٨٪ ی بەشداربوانی فەیسبووك لەکاتی خـەوتنیش ئـۆنلاینن لە ناوتۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك.

هـەروەها بـە پێـی ئامـارێکی سـایتی (ZOPHORIA) لـە لەسـاڵی ٢٠١٨ ئەنجام دراوە بەشێوەیەکی جیاواز باس لە زانیاریەکان دەکات لەسەر فەیسبووك بۆیە لێرە بەشێك لەو زانیاریانە دەخەینە ڕوو .

بەکارهێنەرانی مانگانەی فەیسبووك نزیکەی ٢ ملیار .

بەکارهێنەرانی رۆژانەی فەیسبووك نزیکەی ١,١٥ ملیار .

بەکارهێنەرانی فەیسبووك بەرێژەی ٩٠٪ ی مۆبایل بـەکاردەهێنن بـۆ چوونە ناو تۆڕی فەیسبووك .

رێژەی ١,٤٩ ملیار لە بەشـداربوانی فەیسـبووك زیـاتر لـە ٤ کاتـژمێر فەیسبووك بەکار دەهێنن .

ساڵانە ئەو داتایانە بەرێژەی ١٠٪ زیاد دەکەن .

ڕۆژانە لەڕێگەی فەیسبووکەوە بەکارهێنەرانی فەیسبووک ١٠ملیار جار سەیری سایتی تر دەکەن .

ڕێژەی ٦٣٪ ی بەکارهێنەرانی فەیسبووک مێینەن

نزیکەی ٨٣٦ ملیۆن فەیسبووکی ساختە هەیە .

فەیسبووک نزیکەی ٢ ملیار و یوتوب نزیکەی ١,٥ ملیار و وی چات نزیکەی ٨٨٩ ملیۆن و تویتەر نزیکەی ٣٢٨ ملیۆن و سناپ چات نزیکەی ٢٥٥ ملیۆن بەشداربوو ریزبەندی وەردەگرن[١]

## فەیسبووک لەهەرێمی کوردستان :

هەرێمی کوردستان هەم وەك جوگرافیا هەم وەك خەڵکی هەرێمەکە هۆگری تۆڕی کۆمەڵاتی فەیسبوك بوون لەناوخۆی وڵاتدا لەڕێگەی فەیسبووك پەیوەندی دروست دەکەن, بەهەمان شێوە لەدەرەوەی وڵاتیش پەیوەندی و هاوڕێیەتی و ئاشنایی زۆر بەهۆی خزمەتگوزاریەکانی فەیسبوك دروست بووە , فەیسبوك زۆر بەئاسانی توانیویەتی تاکەکان لەیەکتری نزیك بکاتەوە ئەمە بەدیوێکی تر رەنگە ببوبێتە هۆکارێکی گرنگ بۆ کاڵبوونەوەی پەیوەندیە

١ https://techcrunch.com/٢٠١٨/٠٩/٢٨/facebook-says-٥٠-million-accounts / ل٢٠١٩\٢\٦

کۆمەڵایەتیـەکان , لەسـۆنگەیەکی تـرەوە زۆر گرنگـە کـە خـەڵکی هـەرێمی کوردسـتان بـەهۆی فەیسـبوکەوە توانیویانـە پارێزگـاری لـەکلتور و داب و نـەریتی خۆیـان بکـەن و تارادەیـەك مێـژوو کلتـوری خۆیان بەجیهان و ناوچەکە ئاشنا بکەن , لەڕووی ئامارییەوە لەعێراق بەگشـتی نزیکـەی ٣,٢٨٨,٥٨٠ کـەس فەیسـبوك بـەکاردەهێنن هەروەها تەنها لەماوەی (٦) مانگ نزیکەی (یەك) ملیۆن کـەس نـاوی خۆیان تۆمارکردوە تاوەکوو ببن بەخاوەنی ئەکاونتی تایبەتی خۆیـان ئەگەر ئەم رێژەیە وەك نموونە وەربگرین کە داتاکـە هـی سـاڵی ٢٠١٣ بۆهەر شەش مانگێك نزیك یەك ملیۆن کەواتە لەساڵی ٢٠١٣ بـۆ سـاڵی ٢٠١٩ دەکاتە شەش ساڵ , شەش ساڵ مانای ٧٢ مانگ بۆهەر شەش مانگێك ملۆنێـك بـە هاوبەشـی و نموونـەی پێشـوو وەربگـرین دەکاتـە نزیکـە (١٢) ملیـۆن لەهەرئەگەرێکـدا, وەك دەزانـین لەبـەر زۆری خواست و رەواجدان بە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوك ڕەنگە زیاتر بێت کەواتە بەنزیکی (١٩) ملیۆن بەکارهێنەر لە عێراقدا هەن , لەبەر ئەوە بـەهۆی زانیـاری رێکخـراوی MAU عێـراق لەپلـەی پێنجـەم دێـت لـەڕووی بەکارهێنـەری فەیسـبووك نـەك وەك تـەواوی تۆڕەکـان کـە لەبەشەکانی پێشوودا ئاماژەمان پێکردوە , گومانیش لەوەدا نیە کـە میللەتی کورد بەشێکە لەوداتایانـە بەهـەمان شـێوە ئەگـەر بمانـەوێت داتایەکی نزیکـی وەربگـرین بـۆ بەکارهێنـەرانی فەیسـبوك کـە ئەگـەر

ژمارەکـــە دابەشـــی پێـــنج بکـــەین بـــەنزیکی دەگاتـــە (٣) ملیـــۆن بەکارهێنەری فەیسبوك هەر لەسەر ئەو بابەتە BBC دەڵێت لە ٨٠٪ عێراقیەکان بە زمانی عربی لەفەیسبوك دەنووسن هەروەها بە رێـژەی ٢٠٪بەزمانی کوردی دەنووسن هەربەپێی داتاکانی دەزگـای social baker دەردەکـــەوێت کـــە عێراقیـــەکان بـــە رێـــژەی ٠,٠٣ ٪ بەکارهێنەری فەیسـبوکن لەجیهانـدا[١] , بـەم جـۆرە عێـراق دەکەوێتـە پـێش ئـەمریکای باشـورەوە, هـەروەها رێـژەی بـەکارهێنانی تـۆڕی کۆمەڵایـەتی فەیسـبوك لـەداتای ٢٠١٨ دەری دەخـات کـە ١٧٤٤٢٠٠٠ بەکارهێنەر هـەن لـەو رێژەیـە ٧٣,٤٪ بـە رەگـەزی نـێر تۆمـارکراوە ,هەروەها رێژەی ٢٦,٦٪ بەرەگەزی مـێ تۆمـارکراوە بەوپێیـەی کـە میللـەتی کـورد رێـژەی ١٥–٢٠٪ دانیشـتوانی عـێراق پێـك دەهێـنن کەواتــە دەردەکــەوێت بــە نزیکــی (٣١٢٠٠٠٠) بەکارهێنــەری فــەیس لەهەرێمی کوردستاندا هەیە[٢]

سودە میدیایەکانی فەیسبووك :

١– هۆکـارێکی گرنگـە بـۆ بڵاوکردنـەوەی ئـەو بەرهەمـە میدیایانـەی کـە گرفتی نەبوونی کـەناڵ و گرفتـی بچـوکی رووبـەری رۆژنامـە و گرفتـی سـەرنج و کـۆمێنتی خێـرا و گرفتـی رێگـری کردنـی فکـری نەهێشـت

[١] تاڤان دلشاد , هەمان سەرچاوەی پێشوو , ١٨٢

[٢] https://napoleoncat.com/stats/facebook-users-in-iraq/٢٠١٨/١٠

چـونكه هەركـەس لەهەرشـوێنێك بێـت بەتـەنها هـەبوونی ئینتـەرنێت دەتوانێــت لەفەیســبووك ببێــت بــە رۆژنامــەنووس یــان هــاوڵاتی رۆژنامەنووس ( كە گوزارشتە لەو كەسـەی رۆژنامـەنووس نیـە ,بـەڵام پیشەی رۆژنامەنووسی ئەنجام دەدات ) .

٢- هـەلێكی باشـە بـۆ ئـەو میدیاكارانـەی كـە دیـارن هـەروەها پێگـەی میـدیایان ناسـراوە تـاوەكوو هـەواڵ و دەنگوباسـی نهێنـی و كێشـە و گرفتی هاوڵاتیان و پێداویسـتیە میدیایـەكانی وەرگـر بـزانن , چـونكە بەنامە یان كۆمێنت بەئاگادەبن لەو ڕووەوە .

٣- فەیسبووك وەك پێگەی ئەلیكترۆنی هۆكارێكی سەرنجراكێش و گرنگە بـۆ گواســتنەوەی هــەواڵ و رووداو هــەم وەك ئــەوەی گــوازەرەوەی هەواڵە لەهەموو دونیادا , هەم وەك ئەوە كە دەتوانرێت لەفەیسـبووك بەخشی تۆمـاركراو یـان پەخشـی راسـتەوخۆ بكرێـت بـۆ هەریـەك لـە ژانەرە میدیاییەكان .[1]

## خزمەتگوزاریەكانی فەیسبووك :

دوای ئەوەی بەشێوەیەكی گشتی باسمان لـە فەیسـبووك كـرد هەروەها ئاماژەمان بەو داتا و ئامارانە كرد كە دەربـارەی فەیسـبووك بلاْو كراوەتەوە لـەم بەشـەی توێژینەوەكەمانـدا هـەوڵ دەدەم تیشـك

[1] نها السيد عبدالمعطى , صحافة المواطن نحونمط إتصالى جديد , دار الكتاب الجامعى , بيروت , ٢٠١٥ , ل ٨٨

بخەمــــە ســـــەر بەشــــەکانی فەیســــبووك کەتایبـــەتن بـــە یەکـــە خزمەتگوزاریەکان هەموو ئەوزانیاریانەی کـە لـەم یەکەیـەدا ئامـاژەی پێکـراوە راسـتەوخۆ لـە کۆمپانیـای فەیسـبووك وەرگـیراوە  ئەمـەش بەمەبەستی ئەوەی کە بەوردترین پێناسە و باس بەشـداری پێبکرێـت و بـــەڕوونی بۆمـــان دەربکـــەوێت کـــە کۆمپانیـــای فەیســـبووك بـــۆ چ مەبەستێك ئەم بەش و یەکانەی داناوە .

## یەکەم: پەڕەی کەسی  Account

پەڕەی فەرمی(کەسی) گوزارشـتە لـەو بەشـەی کـە هەربەشـداربویەك یـاخوود بەکارهێنـەرێکی فەیسـبووك بیـەوێت ببێـت بەئەنـدام لـەناو فەیســبووك دەبێــت ســەرەتا پەڕەیــەك بکاتــەوە, کــە کۆمپانیــای فەیسبووك خۆی ئامادەی کردوە چەند زانیاریـەك داوادەکـات دەبێـت ئەندامە تازەکە وەك فۆرم پڕی بکاتەوە, کـە زانیاریـەکان بـریتین لـە زانیاریە کەسیەکان دەربـارەی بەشـداربوو, هـەروەها نـاو وناونیشـان ئەرکی تایبەتی و ئەدرێسی تایبەت بە بەکارهێنەر دواتر دیاری کردنی شــفرە ( پاســۆرد)  ی تایبــەت بەکەســەکە, نووســینی ئیمــەیل–ی تایبەت ,دوای تۆمارکردنی هەموو زانیاریە داواکراوەکـان  بەکارهێنـەر دەبێتە خاوەنی پێگەیـەکی تایبـەت بـەخۆی وکەلەهەرکاتێکـدا خـۆی

بیەوێت دەتوانێت ریمووڤ یان گۆڕانکاری لەهەریەك لەبەشەکاندا بکات یان پێگەکە بسڕێتەوە .[١]

## دووەم : خزمەتگوزاری پۆست POST

ئەم بەشە لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك شوێنی بڵاوکردنەوەی بابەتە, کە هەریەك لە (وێنە, ڤیدیۆ, هێما , فایلی جۆراوجۆر ناونیشانی ئەلیکترۆنی ( LOCATION),ئیمۆجی ,نووسین, دانانی لینك ) هەموو ئەو بابەتانە دەتوانرێت لەبەشی پۆست بەخش بکرێت دوای پەخشکردنی هەریەك لەو بابەتانە ئەندامەکانی تری فەیسبووك کە هاولینکن یان هاوڕێ بن دەتوانن پۆستەکە ببینن و تێبینی و سەرنجی لەسەر بدەن .

## سێهەم : خزمەتگوزاری لایك LIKE

بەشێکی تری فەیسبووکە, کە بەشداربوو دەتوانێت وەك پەیامێك بۆ بابەتەکانی هاورێکانی بەکاری بهێنێت, کە ئەمانە دەگرێتەوە ( بەرزکردنەوەی پەنجەی گەورە , پیشاندانی دل خۆشی

---

[١] Manta dalal, modern communication with social media , first edition ٢٠١٩ , p. ١٧٨

بەهێما,پیشـاندانی دڵ دەنگـی بـەهێما , پیشـاندانی خۆشەویسـتی بـەهێما) , لایككـردن یەكێكـە لـە گـرنگترین بەشـەكانی فەیسـبووك چونكە بە زیاد بوونی ژمـارەی لایـك چـالاكی پێگەكـە زیـاد دەبێـت و زیاتر بەكارهێنەرەكان بابەتەكان دەبینن , لەبەر ئەوەیـە كـە بەشـێك لە بەكارهێنەرانی تۆڕی كۆمەڵایەتی فەیسبووك لەهەوڵی زیاد كردنـی ژمارەی لایكەكانیانن تاوەكوو ببن بە سپۆنسەری ئەكاونتی تر .

## چوارەم : خزمەتگوزاری گروپ Grope

لەم بەشەدا بەشێك لە هاوڕێیان یـان هـەموو هاوڕێیـانی بەشـێك یـان گروپێكی دیاری كراو دەتوانن گروپێك دروست بكەن كە تایبـەت بێـت بەبوار یان زانستێك, جا ئەو گروپـە ئـۆپن بێـت یـان سـنوور دار بێـت بەهەمان شـێوە نووسـین و وێنـە و دەنـگ و ڕەنـگ دەتوانـدرێت لـەو گروپانــە بــەخش بكرێـت هــەر بەشـداربویەك دەتوانێـت داوەت یـان بانگێشتی هاوڕێیەكی تری بكات بۆ بەشداری و ئەندامێتی ئەو گروپـە وەبــە خزمــەتگوزاری( نــاوی تایبــەتی و رەنگــی تایبــەتی و پێگــەی تایبەتی و كوالێتی نووسین و فۆنتی تایبەتی هەیە) .

## پێنجەم : خزمەتگوزاری کۆمێنت Comment

بەشێکی تری ناوتۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووکە, کە لەزۆربەی تۆڕەکانی تر بوونی هەیە ئەم خزمەتگوزاریش بۆ بەشداری ئەندامانی فەیسبووک دەگەڕێتەوە کە هەرکەسێك پۆستێکی فەیسبووك ببینێت دەتوانێت بۆچوونی خۆی لەسەر بڵێت, ئەم خزمەتگوزارییە بۆهەرکەسێك دەبێت کە بەشداربووی فەیس بوکە ئەم خزمەتگوزاریە بۆ ئەو کەسانەش کارایە کە هاوڕێی یەکتر نەبن مانای کەسێك پۆستێك دەکات ئەگەر کەسێکی تر بیەوێت سەرنجێك بنووسێت لەسەر پەیامەکەی رێگە پێدراوە هەرچەندە فرێندیشی نەبێت .

## شەشەم : خزمەتگوزاری شەیر SHARE

شەیر یەکێکە لەخزمەتگوزاریەکانی تری ناوتۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك لەم بەشەدا ئەندامانی فەیسبووك دەتوانن پەیامی کەسێکی تر بەخش بکەن ئەمە لەکاتێکدا مۆرکی کەسی یەکەم پارێزراو دەبێت و کەسی دووەم کە بڵاوی کردۆتەوە لەئەکاونتی ئەویش دەردەکەوێت بەهەمان شێوە بابەتەکان هەر یەك لەوبابەتانە بن کە لەبەشەکانی سەرەوە ئاماژەمان پێدا جگە لەجۆری یەکەم کە باسمان کرد,دەکرێت شەیری بابەتەکان بۆ یەك ئەندامی فەیسبووك یان چەند ئەندامێك بەپێی ویستی ئەو کەسەی کەدەیەوێت بابەتەکە

شەیر بکات ئەنجام بدرێت لەو کاتەدا سوود لەشەیری تایبەت وەردەگیرێت کە لەرێگەی ماسنجەر دەتوانرێت پەیامەکە بۆ ئەوکاسانە بنێردرێت کە دیاری کراون , دوای ئەوەی شەیری بابەتەکە کرا لایك یان کۆمێنت یان هەر گۆرانێکی تر لەسەر بابەتەکە بنووسرێت دەچێتە سەرهەگبەی زانیاریەکانی پێگەی دووەم کە ئەوکەسەیە پرۆسەی شەیرکردنەکەی ئەنجام داوە ئەمە لەکاتێکدایە تەواوی مۆرکی خاوەندارێتی کەسی یەکەمیش پارێزراو دەبێت .[1]

## حەوتەم : خزمەتگوزاری لایڤ LIVE

خزمەتگوزاریەکی تری تۆری کۆمەلایەتی فەیسبووك کە لەم چەند سالەی رابردوودا هاتە ناو ئەو تۆرەوە بەشی لایڤە, کە لەمرۆدا زۆرترین کاریگەری هەیە هەروەها بەشێکی زۆر میدیای کلاسیك سودیان لی بینیوە بۆ پەخشی راستەوخۆ و گواستنەوەی هەوال و زانیاریەکانیان لەپال ئەوەشدا بەشی خزمەتگوزاری لایڤ توانیویەتی بەشداری یەکلا کەرەوەی هەبێت لەسەر چەند پرسێکی سیاسی و سروشتی جیهان بەشێوەیەکی بەرچاو کەلەپال ئەوەشدا رۆلی گەورەی هەبوە لە دروست کردنی رای گشتی و راپرسی و بلاوکردنەوەی پەیامی گەورە بەرپرسانی جیهان لەسەر ئاستی

[1] حسن قطيم طماح الميطرى , الاستخدامات السياسية لموقع التواصل الاجتماعى "تويتر" من قبل الشباب كويت, نامەی ماستەر (بلاونەکراوە) زانکۆی شرق الاوسط , ٢٠١٣ , ل ٣٠

ئەمەریکا و روسیا و وڵاتـانی تـری جیهـان میکـانیزمی خزمـەتگوزاری لایڤ کردنەوەی ڤیدیۆیە بەشێوەی راستەوخۆ دوای کۆتای هاتن یـان ڕاگرتنی پەخشەکە دەتوانیت هەمان ڤیدیۆ پـەخش و سـەیڤ بکـەیت لەناو ئەکاونتی سەرەکی کەسی بەشدار بوو.

## هەشتەم : خزمەتگوزاری پۆك poke

ئەم خزمەتگوزاریە بـۆ بەرزکردنـەوەی ئـەکتیڤی بەشـداربووان خرایـە گەڕ تاوەکوو کەسی بەشدار بوو لەڕووی هەست کردن و دڵخۆشـی بـە بوونی ئەکاونتەکەی هەست بەوخۆشـیە بکـات کـە ژمـارەی بینـەرانی پۆستەکەی چەند کەسن پـۆك هاوکـارێکی باشـە بـۆ ئـەکتیڤ کردنـی ئەکاونت یان پەیج .[١]

## نۆهەم : خزمەتگوزاری فری Free Service

ئەم خزمەتگوزایە بۆ ئەو کەسانەیە کە کوالێتی هێڵی ئینتەرنێت لایان خراپە, بۆیـە بـە سیسـتمی فـری دەتـوانن فەیسـبووك بـە شـێوازێکی

---

[١] خالد وليد محمود ,شبكات التواصل الاجتماعى وديناميكية التغير فى العالم العربى , دار المدارك للنشر ,بيروت , ٢٠١١ , ل ٩١

سنوردار بەکار بهێنن ئەمەش بۆئەو ولآتانەی کە ئینتەرنێت خاو یان خراپە وای لەبەشدار بوانی فەیسبووك کرد کە دانەبڕێن لەو تۆڕە. [1]

## بوارەکانی بەکارهێنانی فەیسبووك :

### یەکەم :بواری سیاسی

گومان لەوەدا نیە کە بوار وپرسە سیاسیەکان لەسەر ئاستی هەموو جیهان زۆرترین مشتوو مڕی لەهەمبەر دەکرێت لەبەر زیندوویەتی ناواخنی بابەتەکە و زۆری ڕووداوە سیاسیەکان ولەپاڵ ئەو چەندین کەناڵە ئاسمانیی و لۆکاڵیانەی کە ئەمڕۆ لەجیهاندا هەیە ,پاشان لەگەڵ پەیدا بوونی کەناڵی جۆراوجۆری تایبەتمەندی سیاسی هێشتا زانایان و ئەکادیمیانی بواری ڕاگەیاندن پەنایان بردۆتە بەر بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵآیەتیەکان لەناویاندا بەشێوەیەکی زیاتر تۆڕی کۆمەڵآیەتی فەیسبووك ئەمەش بۆ زیندوویەتی بابەت و بەرفراوانی تۆڕەکە دەگەرێتەوە کە فەیسبووك بۆتە ناوەندێکی زۆر بایەخدار بۆ پەخش کردنی پەیامی سیاسی و لێدوانی سیاسەتمەدارانی جیهان لەسەر پرسە گرنگ و گەرمەکانی جیهان .

---

١ محمد النعامنة , تكنولوجيا الاتصالات والشبكات الحاسوبية, ليث الكبيسى , داراثراء للنشر ,عمان, ٢٠٠٩ ل ٢٦٠

پسپۆڕانی زانستی نوێی میدیایی بۆیان دەرکەوتووە کە میـدیای نـوێ لەبەر چەند سەرنجێك جێگای گومانە,بەوەی کەمتر جێگەی متمانـەی بینـــەر و خوێنـــەرێتی بەتایبـــەتی ئینتەرنێتیـــەکان، چـــونکە بڵاوکردنەوەکان بەردەوام جێگەی گومانن و کەسە سەرەکییەکان کـە لەگەڵ میدیای نوێ مامەڵە دەکـەن دیـارنین و ئازادییەکـەی کـە هـیچ سـنورێکی نییـە و کـات وشـوێنی دیـار نییـە و پـەنا دەباتـە بـەر بڵاوکردنەوەی هەواڵی ناڕاست و بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و بۆچونی هەڵە,کە هەموو ئەمانە ڕێگە خۆشکەر دەبن لەبەردەم دروسـت بـونی هەموو جۆرە تاوانێك لەڕێگەی ئەم جۆرە میدیا نوێیەوە[١]

بۆچـونێکی تردەربـارەی گرنگـی مـاس میـدیا و تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان بۆبـواری سیاسـی لـەوەدا دەردەکـەوێت کـە میـدیا زۆر بەئاسـانی دەتوانێت تەشکیل و تەحلیل و بنکۆڵکـاری بـۆ دەسـەڵات و حیـزب و لایەنەکان بکـات کـە لەرێگـەی توێژینـەوە و دروسـتکردنی بەرنامـە و کۆکردنەوەی زانیاری بەرچـاوڕوونیەکی بـاش بـدات بـەو لایەنـەی کـە میدیاکەبۆتـە زمـان حـاڵی, هـەروەها فەیسـبووك وەك یـەکێك لـەڕێگا

[١] چرۆ شەهاب  لە ئەرشیفی رۆژنامەی کوردستانی نوێ  ٤\١٠\\٢٠١٨

گرنگ و کاریگەرەکان دەتوانێت دەسبارێکی باشی سیاسیەکان بێت کە دەتوانرێت لەرێگەی پروپاگەندە و وروژاندنی پرسی هەمەجۆر ئاستی هۆشیاری و بۆچوونی هاولاتیان بزانن هەروەها درك بەوە بکەن پەرچەکرداری خەلکی دوای بیستنی ئەم هەوالە یان ئەنجامدانی ئەم پرۆسە چی دەبێت ؟ هەروەها سیاسیەکانی دونیا سودێکی زۆریان لەفەیسبووك بینیوە کەتوانیویانە یارو نەیاری خۆیان زیاتر بناسن , سەرنجی راستەقینەی خەلك بزانن لەبەرامبەر هەلسوکەوتەدبلۆماسیەکانیان , توانیویانە بزانن پێگەی سیاسیان لەسەر ئاستی حیزب و حکومەتورێکخراوەکان چەندە و بەچ میکانیزمێك کاریگەرتر دەبن ئەوانەش تەنها بە بلاوکردنەوەی بابەتێك یان گرتەیەکی ڤیدیۆیی یان وێنەیەك پاشان پێداچوونەوە بەکۆمێنتەکان .[1]

## دووەم : بواری بازرگانی

ئینتەرنێت بەشێوازێکی گشتی و فەیسبووك بەتایبەتی تر توانیویانە ببن بە بازارێکی کراوە بۆ ساغ کردنەوە و کڕین وفرۆشتنی زۆرێك لە

---

[1] حسن قطیم طماح المطیری , هەمان سەرچاوەی پێشوو , ل ١٥

بەرهەمە جیهانیانەکان لەپاڵ ئەوەشدا کە زانایانی بواری تەکنەلۆژیا بە مەترسیەکی گەورەی دەزانن وێب و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بوون بە بازارێکی ناهەرەمەکی بۆ فرۆشتنی چەك ومادده هۆشبەرەکان و بازرگانی کردن بە مرۆڤ و فرۆشتنی گرتە سێکسیەکان کە ئەمە وەك دیوە خراپەکەی ئەو خزمەتگوزاریە هەستی پێدەکرێت بەتایبەت کە بۆچوونێك هەیە باس لەوە دەکات بەشی دارك نێت پڕمەترسیدار ترین بەشی ئینتەرنێتە کە زۆرترین تاوانی مرۆڤایەتی تێدا ئەنجام دەدرێت , هەرئەمەش وای کردوە کەچەندین بازرگانی ئینتەرنێتی دروست ببن بەپێی داتاکانی کۆمپیانیای (IDG) (INTERNATIONAL DATA GROP) سالآنە بڕی ئالۆ گۆڕی بازرگانی لەرێگەی ئینتەنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانەوە ڕوو لەزیاد بوونە بۆنموونە لەساڵی ١٩٩٦ بڕی ئالۆگۆڕی بازرگانی بە ٣ ملیار دۆلار مەزەندە دەکرێت , بەلآم بۆ ساڵی ٢٠٠٠ ئەم بڕەگەشتۆتەنزیکەی ٥١ملیار دۆلاری سالآنە .[١]

بواری بازرگانی فەیسبووك زۆر زیاتر لەوەی چاوەڕوان دەکرا لەزیاد بووندایە , چونکە لەئێستادا بۆهەموو کالآیەك جۆرێك لەبازاری ئینتەرنێتی و بەتایبەتی فەیسبووك دروست بووە ,تەنانەت رێکلامی تایبەت بە کەناڵی فەیسبووك و کارەکتەری بازرگانی تایبەت بە

[١] د.صادق رابح ,الاعلام والتكنولوجيا الحديثة , چاپی یەکەم , ئیمارات , ٢٠٠٤ , ل ١٤٢

فەیسبووك بوونی هەیە ئەمەش وەك دەرخستەی کاریگەریەکانی فەیسبووك سەیر دەکرێت , زۆرترین بینەر زۆرترین کڕیار بەوپێیەی کە فەیسبووك زۆرترین بەکارهێنەری هەیە زۆرترین کۆمپانیای بازرگانی بەکاری دەهێنن بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانیان هەر لە دروستکردنی یاریە ئەلیکترۆنیەکانی تایبەت بە فەیسبووك تاکوو بابەتی جوانکاری و کڕین و فرۆشتنی ئۆتۆمبیل و خانووبەرە و بازرگانی خواردن و خواردنەوە و بابەتی جوانکاری و پۆشاك و ئامێرەکان و تەنانەت بازرگانی ئاژەڵ و نەخشەی بیناسازی و کڕین و فرۆشتنی بیرۆکەی ئیش و داهێنانە تەکنەلۆژیەکان.

## سێهەم : بواری ڕێکلام

لەگەڵ ئەو بەرەوپێش وەچوونەی کە جیهان بەخۆیەوە بینیویەتی بەگشتی و بواری ئابووری وبازار و ڕێکلام و بازار سازی بازرگان و کۆمپانیا جیهانیەکان لەهەوڵدان بۆزووناساندنی بەرهەمەکانیان لەبەر ئەوەیە لەهەوڵی ئەوە دان کە کالاو شتومەکەکانیان بە کڕیار بناسێنن ,لەکاتێکدا کە فەیسبووك بەو جۆرە خۆی خزاندۆتە ناو مۆبایلەکانی زۆرێك لە تاکەکانی جیهان بۆیە رۆژانە چەندین گرێبەستی جیهانی واژۆ دەکرێت لەنێوان گەورە

کۆمپانیاکانی جیهان و کۆمپانیای فەیسبووك بەمەبەستی رەواج دان بە کالاو و بەرهەم و بازار , بەلام تەنها بەوە نەوەستاون بەلکوو فەیسبووك هاوکارێکی زۆر گرنگی بزنس مان و دیزاینەر و ئەکتەر و فلیم ساز و فرۆشیارە جیهانیەکانە تاوەکوو لەرێگەی فەیسبووکەوە بەرهەم و تواناو داهێنانەکانی خۆیان بخەنە بازار و سیستمی فرۆشتنی ئۆنلاین ببێت بە مارکێتێکی گەورە لەبچوکترین تاکوو گەورە ترین کالای جیهانی ,هەروەها جگە لە رێکلامی بازرگانی ... رێکلامی سیاسیش توانیویەتی لەرێگەی فەیسبووکەوە بێتە مەیدانەکەوە هەر لە پرۆپاگەندەی هەڵبژاردن و ناساندنی کاندید و کەسایەتیە سیاسیەکان تاوەکوو رەواج دان بەفکروئەجێندای سیاسی و پەیرەوکردنی سیستمی پروپاگەندەکردن کەئەمەش جۆرێکی رێکلامە.

## چوارەم : بواری ئاسایش

لەهەر ولاتێکدا کۆمەڵێك نەیار و گروپ و دەستە هەن لەژێر هەرناوێك بێت دەبن بەمەترسی بۆ سەر سیستمی ئەمنی و ئابوری و کۆمەلایەتی ئەو ولاتە بۆیە سیستمی بەرگری جیهان بەهاوکاری

کۆمپانیای فەیسبووك توانیویانە زۆرترین زانیـاری و داتـا لەسـەر ئـەو گـروپ و دەسـتانە بەدەسـت بخـەن بەمەبەسـتی کـۆنترۆڵکردنی هـەر ڕووداوێکی نەخوازراو , لەناو فەیسبووك لەبـەر ئـەوەی زۆر بەئاسـانی دەتوانرێت ناسنامەی راستی بەکارهێنەر ون بکرێت یان بشـێوێندرێت بۆیـە لەلایـەن زۆر کـەس وەك چـەکێکی کاریگـەر بەکاردەهێنـدرێت بـواری ئاسـایش برتیـە لـە ( ئاسایشـی تـاك , کۆمـەڵگا , ئاسایشـی نەتەوایەتی , ئاسایشی خۆراك , ئاسایشـی ئـاو , ئاسایشـی خـاك و ئاسمان ) بۆهەریـەك لـەو چـەمکانە کەسـانێك هـەن دژە بیرکدنـەوەن بەمانای هەوڵی شـێواندنی یـەکێك لـەو بوارانـەدەدەن , هـەم لایـەنی جێبەجێکار بۆ چەسـپاندنی ئـارامی سـوودیان لەفەیسـبووك بینیـوە هەم کەسانێك کە لەهەوڵی تێکداندان سوودیان لە فەیسبووك بینیوە.

## پێنجەم : بواری ئاینی

بەهـەمان شـێوەی بوارەکـانی تـر پیـاوانی دینـی بەهـەموو ئـاین و مەزهـەم و ئایـدۆلۆژیا جـۆراو جۆرەکـان لـەپاڵ هـەبوونی کەناڵـە کلاسـیکیەکان پـەنایان بـۆ فەیسـبووك هێنـاوە, تـاوەکوو وەك سەرچـاوەیەکی زینـدوو و چـالاك پـەیام و بـیرو بـاوەڕ و ئایـدۆلۆژیای

خۆیان بەجیهاندا بلاو بکەنەوە, ئەمەش لەبەر گرنگی و زۆری ڕێـژەی بەشدار بـوانی فەیسـبووك دەگەڕێتـەوە کـە پەیڕەوکـەرانی ئاینـەکان بەکاری دەهێنن .

## شەشەم : بواری کۆمەڵایەتی

لـەپاڵ بـەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان بەشـێوەیەکی گشـتی و فەیسبووك بەتایبەتی کۆمەڵێك کاریگەری ئەرێنی لەسـەر بیرکردنـەوە و زهنی بەکارهێنـەرانی دادەنێـت, ئـەوەش بـەهۆی فراوانـی بابـەت و خزمەتگوزاریەکانی فەیسبووك لەقەڵەم دەدرێت ,هەروەها بەهۆی ئەو کرانەوە فراوانەی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان کە بە ڕووی جیهانـدا کرایـەوە بەکارهێنەر بە ئاسانی دەتوانێت دەنگ و ڕەنگـی بـە تـەواوی جیهـان بگات و ئەمـەش وادەکـات پرۆسـەی ئـەنتی گرەیشـنی کلتـور و بـیرو بۆچـوون و فەرهـەنگی میللـەتانی دونیـا کاردانەوەلەسـەر یـەکتری دروست بکەن و پێوەندیەکۆمەڵایەتیەکان هێندەی تر فراوان بکەن [1]

جگــە لەهــەموو ئــەو بــوار و بابەتانــەی کــە ئاماژەمــان پێــدا تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بەگشتی توانیویانە لەهەموو ڕوویەکەوە بایەخ و گرنگی میدیای کلاسیك کەم بکەنەوە هـەم لـەڕووی خێرایـی گەیانـدن

---

[1] https://mawdoo۳.com لەبەرواری ١٠\٢\٢٠١٩

هەم لەفراوانکردنی تۆڕی میدیاکانی ڕۆژنامەنووس ,هەروەها وێب و تۆڕەکان میکانیزمەکانی پرۆسەی ڕێکلام و بەبازار کردن و پروپاگەندە و هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن و بەشێکی زۆر لە ڕووداوە سروشتیەکانی جیهانیان گۆڕی, لەگەڵ ئەوەشدا لە بازنە فکری و خاوەندارییە کەسیەکان رزگاری کردن, بەقۆناغێکی گواستنەوەی خێرا گەورەترین و خێراترین وەچەرخانی مێژوویان هێنایە کایەوە بەوەی کە لەمڕۆدا تاکێکی کورد زۆر بەئاسانی دەتوانێت لە کاتژمێر شەشی سەرلەبەیانی بۆچوونی سەرۆکی ئەمریکا یان ڕووسیا یان دواین لێدوانی سەرۆکی فیفا یان هەواڵەکانی ناو هۆلیود لەرێگەی فەیسبووك یان تویت یان ئینستاگرامەوە بزانێت و لەهەمان کاتدا وەڵامێکی هەبێت وەك کۆمێنت بۆ هەرپۆستێك ئەمەش ئەو چەمکەی هێنایە ناو بابەتی راگەیاندن کە بریتیە لە هاولاتی رۆژنامەنووس یان رۆژنامەنووسی هاولاتی کە گوزارشتە لە بەشداریەکی کارای تاك لەپرۆسەی راگەیاندن وەك ئەو نموونەیەی کەناڵی الجزيزە لەشۆڕشی بەهاری عربی پەیرەوەی کرد لەڕێگەی تاکەوە چەندین ڕوومالێ گرنگی ئەنجامدا یاخوود وەك دامرکانەوەی کودەتا سەربازیەکەی ئەم چەند ساڵەی تورکیا کەلەڕێگەی لایڤێکەوە تەواوی پرۆسەکە گۆڕنکاری سەرتاسەری بەسەرداهات ,بواری کۆمەلایەتی هەموو پێگە کۆمەلایەتیەکان وەك لە ناوەکانیاندا دیارە بەجۆرێکی ئامارژەیی

گوزرارشـــتن لــه بــیرو راگۆڕینــەوه و دروســت کردنــی پەیوەنــدی کۆمەڵایــەتی ,بۆنموونــه ســایتی ODYSSEY لەچـەند پــەراوێکی نوســـراوادا لـــه ژێرناونیشـــانی WHY INSTAGRAM IS RUNNING SOCIETY ئامــاژه بــەوه دەکــات و دەڵێــت :

تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان دووەم نیشتیمانی ئێمەی مرۆڤن , ئەگەر رۆژێـك تێ پەڕی بەسەرتدا ونەتوانی سەردانێکی تۆڕێکی کۆمەڵایەتی بکـەیت ئـەوا بزانــه بەشـێك لــه هەسـتی کۆمەڵایــەتی بونـت لەدەسـت داوه چونکه جوانی جیهان لـەو پەیوەندیەکۆمەڵایەتیـەدا رەنـگ دەداتــەوه هــەروەها پێگــه کۆمەڵایەتیــەکان هاوکــارن لــەڕووی کۆمەڵایەتیــەوه تاوەکوو تاك زانیاری پێشینەیی هەبێت لەسەر جیهـانی دەرەوه وەك بازارکردن دانیشـتن وخوێنـدن,زمان و کلتـورو چـەندین دیـوی تـری کۆمەڵایەتی . [١]

## یوتوب : YouTube

یوتوب یەکێکی تره لـەو تـۆڕە کۆمەڵایەتیانـەی کـه بینـەر و بەشـدار بوویـەکی زۆر هەیـه ئـەوەی کـه بۆتــه سـیفەتی یوتــوب بریتیــه لــه خزمەتگوزاری بینینی پارچەی ڤیدیۆیی کەبەشداربوان دەتـوانن وەك سەرچاوەی زانیاری یان فێرکاری سوود لـەیوتوب وەربگـرن لێـرەدا

---

[١] http://expandedramblings.com/index.php/important-instagram-stats/#.UtU٨٧٤uzKph لەبەرواری ١٤\٢\٢٠١٩

لـــەڕووی مێـــژوو و تایبەتەمەنـــدی یوتـــوب بـــە ســـوود وەرگـــرتن لەچەندسەرچاوەیەکی زانستی باس لەپێگەی یوتوب دەکەین .[1]

دامەزراندنی یوتوب وەك پێگەیـەکی سـەربەخۆ دەگەڕێتـەوە بـۆ ١٤ی مانگی فێبریوەری ساڵی ٢٠٠٥ کـە لەسـەر دەسـتی سـێ فەرمانبـەری کۆمپانیـای PAY BAL ی ئەمـەریکی بـەناوەکانی ( چـاد هێـرلی ستیڤ چین ,بنغازی جاود کریم) دامەزراندنی یوتوب لەسەر بیرۆکـەی باوەڕ بەخۆ بوون بونیات نراوە Broad cast yourself کـە ئـەم دروشمە گوزارشت لەوە دەکات لەهەرشوێنێکی جیهان بیت دەتوانیت بینەری ڤیدیۆبیت بەو مەرجەی تۆڕی ئینتەرنێت هەبێت .[2]

دوای ئەوەی پێگەی یوتوب لەساڵی ٢٠٠٦ لەلایـەن کۆمپانیـای گۆگـل کڕدرا یوتوب  بوو بەو دە پێگە ئەلیکترۆنیەی جیهان کەلـە ریزبەنـدی یەکەمەکانی جیهانن ,لەپێگەی یوتوب چەند یاسایەك هەیە کە تیایـدا هاتووە :

**یەکەم** : ئەو ڤیدیۆیانەی کە لەلایەن یوتوبـەوە بـڵاو دەکرێتـەوە هـیچ کەسێك مافی بردن یان بڵاوکردنەوەی نیە .

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Facebook#User_growth لە ٢٠١٩\٢\١٠

[2] اسامة غازی المدنی ,دور شبكات التواصل الاجتماعی فی تشكيل رأی العام لدی طلبة الجامعات السعودية , رياض , جامعة ام القری ,قسم الاعلام, (رسالة دكتورا)  منشور , سعودية , ٢٠١٤ , ل٤٠٠

**دووەم** : نابێت جەستەی مرۆڤ بە تەواوی دەرکەوێت کە هەمووی ڕووت بێت .

سێهەم : نابێت ڤیدیۆیەك بڵاو بکرێتەوە کە سوکایەتی بە تاك یان ئایدۆلۆژیا یان نەتەوەك بکرێت .[1]

**هەربەپێی** ئاماری (YouTube statist) **هاتوە** کە مانگانە نزیك چوار ملیار سەعات ڤیدیۆ پەخش دەکرێت لە سایتی یوتوب کە ٧٢ خولەك ڤیدیۆ لە هەر چرکەیەکدا بڵاو دەکرێتەوە کە دابەشدەکرێت بەسەر ٥٣ وڵاتدا و بە ٦١ زمان دادەبەزن.[2]

## خزمەتگوزاریەکانی یوتوب :

**یەکەم** : خزمەتگوزاری دروست کردنی کەناڵی تاکە کەسی : لەم بەشەی خزمەتگوزاری پێگەی ئەلیکترۆنی یوتوب-دا بەکارهێنەر دەتوانێت کەناڵێکی کەسی دروست بکات بۆ بڵاوکردنەوەی گرتەی ڤیدیۆیی و ناردنی نامە و گۆڕینەوەی بۆچوون و سەرنج و دروست کردنی گروپی تایبەت بە بینی پارچە ڤیدیۆی ویستراو ,لەم بەشەدا تەواوی زانیاری لەسەر کەسی بەکارهێنەر و جۆری ئایدیا و لۆکەیشن و ناو ناونیشانی بەکارهێنەر هەیە .

[1] https://ckb.**wikipedia.org** لە ٢٠١٨\١٢\٢١

[2] غزال مریم,شعوبی نورالهدی,**هەمان سەرچاوەی پێشوو** ,ل١٧

**دووەم** : خزمەتگوزاری لایك : وەك زۆرێك لە پێگەو تۆڕەكۆمەڵایەتیەكانی تر پێگەی یوتوب خزمەتگوزرای لایك–ی هەیە كە بەكارهێنەر بۆ دەربڕینی هەستی خۆی دەستەواژەی لایك بەكار دەهێنێت .

**سێهەم** : خزمەتگوزرای كۆمێنت : بەكارهێنەر لەكاتی بینینی ڤیدیۆ لە پێگەی یوتوب بۆ خستنە ڕووی بیر و بۆچوون و سەرنجی بەكارهێنەرانی پێگەی یوتوب خزمەتگوزاری توانج یان كۆمێنتی دابین كردوە , كە لەوێوە بەكارهێنەر دەتوانێت بۆچوونەكانی خۆی پەخش بكات .

**چوارەم** : خزمەتگوزرای لیستی ڕێكخستنی ڤیدیۆكان : لەم بەشەدا پێگەی یوتوب بۆ كار ئاسانی بەكارهێنەرانی ڕێگە دەدات كە لیستی تایبەت بە جۆر و كوالێتی و چۆنیەتی ئەو پارچە ڤیدیۆیانە دروست بكرێت كە تیایدا بڵاو دەكرێتەوە كە ئەمەش هاوكارێكی باشی ئەو كەسانەش دەبێت كە بەدوای گرتەی تایبەت بە ویست و پێداویستیەكانیان ,لەبەر ئەوە لیستی تایبەت بە گرتە جیاوازەكان لەچەندین بەشی جیاوازی تایبەت بە ڤیدیۆكارایە لەپێگەی یوتوب . [1]

---

[1] https://www.brandwatch.com/blog/youtube-stats/ لەبەرواری ٢١\١٢\٢٠١٨

**پێنجەم** : خزمەتگوزاری ئەپلۆدی گرتەی ڤیدۆیی : لەگەڵ ئەوەی بەشێکی زۆرلە پێگەکانی تری کۆمەڵایەتی خزمەتگوزاری بڵاوکردنەوەی ڤیدیۆیان فەراهەم کردوە ,بەڵام پێگەی یوتوب جیاواز لە هەموویان زیاتر سەرنجی لەسەر بڵاوکردنەوەی پارچەی ڤیدیۆییە کە وەك لەسایتی brand watch دا هاتوە کە لە یەك دەقەدا نزیکەی ( ٤٠٠) سەعات پارچەی ڤیدیۆیی ئەبلۆد دەکرێت لەبەرامبەردا نزیك بەو رێژەیە وشەی How to بۆ گەڕان بە دوای پارچە ڤیدیۆی ویستراو بەکاردێت کەزیاتر بۆمەبەستی فێرکاری دەربارەی زانست و فێربوون لەلایەن بەکارهێنەرانیەوە ئەنجام دەدرێت .

**شەشەم** : خزمەتگوزاری داونلۆد(داگرتنی ڤیدیۆ) ئەم خزمەتگوزارریە وەك یەکێك لەهەرە خزمەتگوزاریە گرنگەکانی یوتوب سەیر دەکرێت , دوای ئەپلۆدکردنی هەر گرتە ڤیدیۆیەك بەکارهێنەری یوتوب دەتوانن ڤیدیۆکە داونلۆد بکەن, مانای گرتە ڤیدیۆکە بکەنە ناو ئامێری کۆمپیوتەر یان ئامێرە زیرەکەکان,هەرچەندە ئەم خزمەتگوزارییە لە بەشێکی زۆر لەتۆڕەکۆمەڵایەتیەکاندا بوونی هەیە بەڵام تایبەتمەندی ڤیدیۆی یوتوب بریتیە لەوەی کە هەرچەندە قەبارەی ڤیدیۆکە زۆربێت دەتوانرێت ئەبلۆد یان داونلۆد بکرێت,هەروەها هەرچەندە ژمارەی ڤیدیۆکان زۆربێت کێشە دروست

ناکـات , ئـەو ڤیدیۆیانـەی کـە زیـاتر خواسـتی لەسـەرە بـریتین لـە ڤیدیۆکانی ( فێرکردنی زمان , ئیشی دەست , زانیـاری و کۆمپیوتـەر و تەکنەلۆژیا , دروستکرد و چاککردنی پارچەکان , هـەروەها بیرۆکـە و هونــەری داهێنــانی ســینەمایی و هونــەری بــەرگری و جوانکــاری خانمان ) .

داونلۆدکردنی گرتەی ڤیدیۆیی هەم لەناو یوتـوب هـەم بـە بەرنامـەی تایبەت بۆ داگرتنی گرتەکان دەتوانرێت ئەمبار بکرێت , ئەوکەسانەی کە زیاتر یوتوب بـەکاردەهێنن بـە (یوتوبـەر) نـاودەبرێن, کـە کاریـان دروســتکردنی ڤیــدیۆ و دەســتکاری کردنــی ڤیــدیۆ پێــدانی لایــەنی هونەری مۆنتاژ و دەرخستەی بیرۆکەی کارەکانە, دواتـر بلاوکردنـەوە و فرۆشتیانە کەئەمـەش وەك سەرچـاوەیەکی دارایـی بۆیوتوبـەرەکان دەست نیشان دەکرێت .

## بوارەکانی بەکارهێنانی یوتوب :

**یەکەم** : بواری سیاسی : جیهانی سیاسەت و سیاسەتمەندان **هەمیشە** لە هەوڵی ئەوەدان کە زۆرترین پەیام بە بەکارهێنانی رێگـای جیـاواز

بە هەواداان و لایەنگرانی خۆی بگەیـەنێت , پێگـە کۆمەڵایەتیـەکانیش وەك سەرچاوەیەکی هەم ئاسان هەم کاریگەر بونەتـە جێـی سـەرنجی ئـــەو کەســـانە, لەناویانـــدا پێگـــەی یوتـــوب وەك یـــەکێك لـــە تۆڕەکۆمەڵایەتیـــەکان لەلایـــەن سیاســـەکانی جیهـــان پشـــتی پێدەبەسترێت بەمەبەستی گەیاندنی ئایـدۆلۆژیا و بەرنامـەی سیاسـی خۆیان بەتایبەت کە لە یوتوبـدا گرتـەی ڤیـدیۆیی بڵاودەکرێتـەوە کـە زیـاتر لـە پەیامـە میدیایـەکانی وەك ( نوسـراو بیسـتراو) کاریگـەری دروست دەکەن , لەبەر ئەوە لەدوای دروسـت بـوونی پێگـەی یوتـوب کەسایەتی سیاسی جیهان وەك کەناڵێکی جیهانی سودیان لێ بینیـوە و تەنانەت بۆ دروستکردن و پێوانە کردنی رای گشـتی زانینـی هـەل و مـەرجی سیاســی و ئــابوری و ئایـدۆلۆژی لەرێگــەی بڵاوکردنــەوەی گرتەیەکی ڤیدیۆیی توانیویانە سود لە یوتوب وەربگرن.

**دووەم** : بـواری بازرگـانی : دوای ئـەوەی بۆیەکـەم جـار لـە مـانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٧ پێگەی یوتوب یەکەمین رێکلامی بڵاوکـردەوە ئەمە وای لە بازرگانـان و سـەرمایەدار و برانـدە جیهانیـەکان کـرد بـۆ برەو دان بە کاڵا و کەل وپەلەکانیان پشت بە پێگەی یوتوب ببەسـتن تاوەکوو جۆرێك لەبازرگانی جیهـانی دروسـت بکـەن هـەروەها بـەپێی ئامـاری پێگـەی (برانـد) بۆسـاڵی ٢٠١٨ رێـژەی لـە ٩ ٪ ی گرتـە ڤیدیۆیەکانی ناو پێگەی یوتوب تایبەتن بـەبازرگانی کـردن لـە نێـوان

ولأتانی جیهان ئەمەش زیاتر بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە بەکارهێنـەر لـە پێگـەی یوتـوب دەتوانێـت بـە نزیـك (٩٠) زمـان بگـەرێت بـەدوای پێداویستیەکانی رۆژانەی دا [١]

## ئینتسا گرام Instagram

پێگـەی ئینسـتاگرام یەکێکـە لەسەرچـاوەکانی دروسـت بـوونی ئـەو پەیوەندیانەی کەباسمان کرد بۆنموونە ناردن یان ئەپلۆدی وێنـە یـان گرتەیەکی ڤیدیۆیی شوێن و جۆری ژیـان و پێگـەی کەسـەکانمان بـۆ نمایش دەکات و دەتوانێت گفتوگۆیەکی جەستەیی دروست بکات کـە پاشـان هـەنگاوی دووەم دەبێـت بـە بەشـێك لـە تـەواوی پەیوەنـدی کۆمەلأیـــەتی لـــەنێوان بەکارهێنـــەرانی لەســـەر ئاســـتی جیهـــان بەشێوەیەکی گشتی . [٢]

پێگەی ئینستا راستەوخۆ دوای دروست بوونی بـەهۆی ئـەو بۆشـاییە میدیایەی کە هەبوو هەر زوو ژمارەیـەکی زۆر بەشـداربووی لای خـۆی تۆمار کرد و هەژماری بەکارهێنەرانیشی رۆژانە لـەزیاد بوندایـە لەبـەر ئـــەوە بـــواری کۆمەلأیـــەتی و تێکـــەلأوی هەســـت و کلتـــور و زمانـــە جیاوازەکان پەرەیان سەند بۆنموونە هەربەشـداربویەك لـە ناوپێگـەی

[١] https://www.webwise.ie/parents/what-is-youtube/ لەبەرواری ٢٠١٩\٢\١٤

[٢] https://www.theodysseyonline.com/why-instagram-is-ruining-society لەبەرواری ٢٠١٩\٢\١٤

ئینستاگرام دەتوانێت ( ٥) پێگەی هەبێت هەروەها ڕێگەی پێدراوە (١٥) گروپ دروست بکات و نزیك بە (٧٥٠٠) فۆلۆ بنێرێت بۆ کەسانی دی هەروەها لەرێگەی ٣٩ زمانەوە بەرەو بە پەیوەندیە کۆمەلأیەتیەکان دەدرێت لە ناو پێگەی ئینستاگرام . تۆڕێکی کۆمەلأیەتیە بۆ بلأوکردنەوەی وێنە و ڤیدیۆ کەلە تشرینی یەکەمی سالّی ٢٠١٠ لەلایەن پرۆگرامسازی بەناوبانگی ئەمەریکی کیڤین یۆرك سیسترۆم دامەزراوە, ئینستا گرام وەك تۆڕەکۆمەلأیەتیەکانی تری جیهان گرنگی و بایەخی تایبەتی خۆی هەیە بەتایبەت کە دەتوانرێت وێنە و ڤیدیۆی تیادا بلأو بکرێتەوە , بەپێی داتاکان لەئێستادا نزیکەی یەك ملیار بەکارهێنەری مانگانە و نزیك ٤٠٠ ملیۆن بەکارهێنەری رۆژانەی هەیە کە لەوڕێژەیەدا نزیکەی لە ٪٦٤ بەکارهێنەرانی خوێندکارانی زانکۆن , هەرلە چوارچێوەی خزمەتگوزاریەکانی ئەم تۆڕەدا بەکارهێنەر دەتوانێت بە(٣٩) زمانی زیندووی جیهان پۆست بکات و زانیاری لەناو تۆڕی ئینستاگرام وەربگرێت و بلأوی بکاتەوە , تۆڕی ئینستا گرام دوای لەسالّی ٢٠١٢ لەلایەن کۆمپانیای فەیسبووك بەبڕی یەك ملیار دۆلار کڕدرا لەئێستادا کۆمپانیای فەیسبووك وەك بەشێك یاخوود بۆ دەوڵەمەند کردنی خزمەتگوزاریەکانی خۆی سودی لێ دەبینێت, هەرچەندە تۆڕی کۆمەلأیەتی ئینستاگرام وەك یەکەیەکی سەربەخۆ کار دەکات و

بەکارهێنەرو پەیرەوانی تایبەتی خۆی هەیە و بەردەوام لەهەوڵی تازەگەری و داهێنان و پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری زیاتر دایە بەڵام بۆتە بەشێك لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك (زیاتر لەڕووی موڵکداری و داهاتەوە)[1]

## بەشەکانی خزمەتگوزاری ئینستاگرام :

**یەکەم** :خزمەتگوزاری ناردنی نامە : ئەم بەشە لە پێگەی ئینستاگرام تایبەتە بە ناردنی نامە بۆ ئەو کەسانەی کە بەکارهێنەر مەبەستیەتی کە بەشێوەی چات واتا نووسین یاخوود ناردنی نامەی دەنگی دەتوانرێت پەیام ئاڵوگۆڕ بکرێت .

**دووەم** : خزمەتگوزاری کامێرا : مانای لە پێگەی ئینستاگرام ئەم بەشە تایبەتە بەبەکارهێنانی کامێرا بەشێوەی دەنگ و رەنگ لەنێوان بەکارهێنەراندا کە دەتوانن بۆ گفتوگۆ و گۆڕینەوەی بۆچوونەکان بەشێوازی زیندوو کامێرای سمارت فۆن یاخوود مۆبایل یان هەر ئامێرێکی تری ئەلیکترۆنی بەکار بهێنێت .

**سێهەم** : خزمەتگوزاری ناردنی وێنە : بۆ ئەپلۆدی وێنە لە پێگەی ئینستاگرام دوو شێوازی سەرەکی هەیە یەکێکیان دانانی وێنەی

[1] https://ckb.wikipedia.org/wiki/%D٨٪٦A٪DB٪٨C%D٨٪٩C٪٨٦٪٨DA%AF%D٪٧A٪٨B٪١D٪٨A٪٧D٪٩D٪٨٥ لەبەرواری ٢٠١٩\٢\١٤

ویستراوە لەبەشی ئەکاونتی سەرەکی شێوازی دووەم دانانی وێنەیە لە بەشی ستۆری کە بۆماوەیەکی کاتی دەمێنێتەوە پاشان بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی نامێنێت .

**چوارەم** : خزمەتگوزاری لایڤ : ئەم بەشە لە پێگەی ئینستاگرام تایبەتە بە تۆمارکردنی گرتەی ڤیدیۆیی بەشێوەی راستەوخۆ و پەخشکردنی مانای بەکارهێنەر دەتوانێت بەهەمان شێوەی فەیسبووك یان تۆرەکۆمەڵایەتیەکانی تر خزمەتگوزاری لایڤ کردن لە پێگەی ئینستاگرام بەکار بهێنێت بۆ گەیاندنی پەیامەکانیان.

**پێنجەم** : خزمەتگوزاری لایك : ئەم بەشە لە پێگەی ئینستاگرام تایبەتە بە دەربڕینی هەستی بەکارهێنەر بۆ بابەت و نوسراو و وێنە و گرتە ڤیدیۆیەکانی ناو تۆڕەکە .

**شەشەم** : خزمەتگوزاری فۆلۆ: ئەمەش بەشێکە لە قبوڵکردنی هاوڕێیەتی نێوان ئەندامانی بەشداربووی پێگەی ئینستا گرام بۆ بینینی بابەت و بڵاوکردنەوەکانی ئەندامانی تر لەناو تۆڕەکەدا .

**حەوتەم** : خزمەتگوزاری دروستکردنی گروپ کە ئەمەش لە پێگەی ئینستاگرام تایبەتە بەو کەس و گروپانەی کە لەیەك بازنەی کار یان حەز و خولیای ژیانیان کۆیان دەکاتەوە دەتوانن گروپێك تاکوو پانزە

گرووپی چات و دەنگ و ڕەنگ دروست بکەن تاوەکوو لەنێوان یەکدی ئاڵوگۆڕی بۆچوونەکانیان بکەن .

## بوارەکانی بەکارهێنانی ئینستاگرام :

**یەکەم** : بواری بازرگانی : دوابەدوای ئەو گەشەسەندنەی لە جیهاندا لەبواری ئابوری و بازرگانیدا هاتە کایەوە کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنان هەم لەئاستی فرۆشت و هەم لە ئاستی بەرهەمهێنانی ڕێکلام بیریان لە بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان کردەوە تاوەکوو بتوانن وەك ناوەندێك بۆ ساغکردنەوەی کاڵاکانیان چاوی لێ بکەن , تۆڕی کۆمەڵایەتی ئینستاگرام وەك یەکێك لە تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانی ئەمرۆ کە نزیکەی یەك ملیار بەکارهێنەری مانگانەی هەیە بۆتە یەکەیەکی گرنگ و کاریگەر و خێرا بۆ بازرگانان و کڕین و فرۆشتن لەسەر ئاستی جیهان کە بۆ دووپاتی ئەم زانیاریە لە پێگەی ئەلیکترۆنی DMR کە تیادا هاتوەتاکوو مانگی (١١) ی ساڵی (٢٠١٨) نزیکەی (٨) ملیۆن بەکارهێنەر لە تۆڕی کۆمەڵایەتی ئینتساگرام پێگەی تایبەتیان هەیە بۆکاروباری بازرگانیکردن لەناوئەوتۆڕە لەسەرئاستی جیهان .[١]

---

[١] https://**expandedramblings.com**/index.php/important-instagram-stats/ لەبەرواری ٢٠١٩\٢\١٤

لەهەریەکـە لەبەشـەکانی خزمـەتگوزاری پێگـەی ئینسـتاگرامدا کـە پێکهاتوون لە ئەبلۆدی ڤیدیۆ و وێنە و ناردنی نامـە و پۆسـتی جۆراو جـۆر ڕێـژەی لـە ١١ ٪ بڵاوکراوەکـانی بـریتین لـە بابـەتی بازرگـانی لەسـەر ئاسـتی جیهـان کـە ئـەم ڕێژەیـە سـاڵانە ڕوو لـە زیـاد بوونـە بەوپێیەی بەردەوام ئاست و قەبارەی ئاڵوگۆڕەبازرگانیەکان لەگەشـە و زۆربووندایە ، بەکارهێنانی پێگەی ئینسـتاگرام لـەبواری بازرگانیـدا بەشـێوەیەکی فـراوان بەرجەسـتەدەکرێت بۆنموونـە لەسـایتی SMALL BUSINESS TRENDS کەلە مـانگی ١٠ ی ٢٠١٨ دا لـە دوو توێی باسێکی ئەکادیمیدا ٢٥ جۆر بازرگانی مۆدێرن دەخاتـە ڕوو کـە لەڕێگـەی پێگـەی ئینسـتاوە جموجـۆڵی بازرگـانی پـێ ئـەنجام دەدرێـت ، کـە بەشـێکی بـریتین لـە فرۆشـتنی ناوچـەی گەشـتیاری وێنەی فۆتۆگرافی ، باکگراوند و بەرنامەی کۆمپیوتـەری ، داواکردنـی مـاپی چێشـتخانە و میوانخانـە ، بابـەتی مـەیك ئـەپ و کـەل و پـەلی وەرزشی و پێداویستی ڕۆژانە، جل و بەرگ و براندە جیهانیەکان ، کە هەر بەشێك لەو بەشانە بە ستایل و شێوازی جیاواز توانیویانە سوود لە پێگەی ئینسـتاگرام وەربگـرن بـۆ بازرگـانی کـردن لەسەرتاسـەری جیهاندا [1]

---

[1] https://**smallbiztrends.com**/٢٠١٣/٠٩/using-instagram-for-business.html/ لەبەرواری ١٤\٢\٢٠١٩

جگــە لــەبواری بازرگــانی تــۆڕی کۆمەڵایــەتی ئینســتاگرام وەك هەرپێگەیەکی کۆمەڵایـەتی تـر بۆ بـوارە جۆراوجۆرەکـان بـەکاردێت سیاسیەکان هونەرمەندان وەرزشـکاران بەتایبـەتی وەرزرشـی تـۆپی پـێ و لەشـجوانی هــەروەها کەسـایەتیە ئـاینی و کۆمەڵایەتیــەکان بـەکاری دەهێـنن ,بــەڵام بەلەبەرچـاوگرتنی ڕێـژەی بەکارهێنــەران و ئاسـتی کاریگەریـەکانی تۆڕەکـان ئینسـتاگرام کـەمتر لـە فەیسـبووك لەلایەن کەس و حیزب و کۆمپانیاکانی بازرگانی هونەرمەندان و کۆی گشتی وەرگرە ئەلیکترۆنیەکانەوە بەکاردەهێنرێت .

## تویتەر TWITTER :

تویتەر یەکێکە لـەو تۆڕەکۆمەڵایەتیانـەی کـە لـە ٢١ی مارسـی ٢٠٠٦ لەلایـەن (جـاك دۆرسـی ) لەسانفرانسـیکۆی ویلایەتەیـەکگرتوەکانی ئەمــەریکا دروسـت کـراوە چـوار مـانگ دوای دروسـت کردنـی تـوانرا بلأوکراوەی تیادا بلأوبکرێتـەوە , تـۆڕی کۆمەڵایـەتی تویتـەر یەکێکـە لەو دە تۆڕە جیهانیەی کـە لەریزبەنـدی باشـترین تۆرەکـانی جیهـانن هــەروەها لەهــەموو وڵاتــانی جیهانـدا بەکاردەهێنـدرێت ,یـەکێکی تـر لەتایبەتمەندیـەکانی تویتــەر ئەوەیــە کــە هــیچ وڵاتێــك سانسـۆری بۆدانـەناوە ,مانـای تویـت لـە جربـوەی باڵنـدەوە هـاتوە لەئێسـتا دا

( جاك دورسی ,نوح گلاس ,ئیڤان ویلامس ,بیزستوون) بەخاوەنانی تویتەر دادەنرێن , یەکێکی تر لەتایبەتمەندیەکانی تویتەر ئەوەیە کە گرنگی داوە بەکورت بڕی بۆیە لەنامەنوسیندا تەنها (١٤٠) پیت دەنوسێت,تویتەر لەداتای ساڵی ٢٠١٦ دەرکەوتوە نزیکەی (٣١٩) ملیۆن بەشداربووی مانگانەی هەیە, کەبەشێوەیەکی بەرچاو ژمارەی بەکارهێنەرانی زیاد دەکات , بۆ نموونە لەهەڵبژاردنەکانی سەرۆکی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا تویتەر دەبێت بە باوەرپێکراوترین

تۆڕی کۆمەلأیەتی, تویتەر بۆیەکەمجار ژمارەیەکی پێوانەیی تۆمار کرد لەساڵی ٢٠١٣ کەلەیەك چرکەدا (٣٨٨,٣٣) تویت بوو هەروەها ئەم ڕێژەیە بەردەوام لە بەرزبوونەوەدایە کەبەپێی سەرچاوەزانستیەکان تویتەر لە ٢٠١٨ دا ڕۆژانە نزیکەی (٤٠) ملیۆن تویتی تێدا دەکرێت[١] ,لەرووی ڕیزبەندی ولأتانەوە ئەمەریکا لەپلەی یەکەمدایە بۆ تویت کردن کە خاوەنی زیاد ١٠٧ ملیۆن بەکارهێنەرە پاشان بەرازیل کەخاوەنی ٣٣ ملیۆن بەکارهێنەرە پاشان یابان کە خاوەنی ٢٩ ملیۆن و دواتر بەریتانیا کەخاوەنی ٢٣

[١] Beki winchel , Kenneth D. plawman, The social media communication matrix ,printed by business export , ٢٠١٥ ,p.٩٨

مليـۆن و دواتــر ئیندۆنیســیا  کــەخاوەنی ١٩ ملیــۆن بەکارهێنــەرن تویتەر وەك یەکێك لەتۆڕەکۆمەلأیەتیە گرنگەکان زۆرێك لەبەر پرسان و ســـەرۆکی ولأتـــان بـــەکاری دەهێـــنن وە راســـتەوخۆش خۆیـــان سەرپەرشـــتی دەکـــەن جگەلـــەوانیش ســـینەماکار و وەرزشـــەوانە بەناوبانگەکان بەهەما شێوە تویت زۆر بەکاردەهێنن.[1]

تویتــەر بەسەرچــاوەیەکی هــەواڵی ســەیردەکرێت و زۆرتــرین کــەس چاوەڕێی تویتێکن بۆ زانینیی هەواڵ و زانیاریــەکان ,بەهــەمان شــێوە لەبەشــێکی زۆر لەولأتانــەی کــە خــاوەنی هــەواڵی گــەرمی سیاســین بەتایبـــەت  تـــۆڕی کۆمەلأیـــەتی تویتـــەر سەرچـــاوەی خێـــرا و باوەرپێکراوی دانیشتوانەکەیەتی .




---

١ https://ckb.wikipedia.org/w/index لە ٢٠١٩\٢\٢٠

## یەکەم نەخشە(هێڵکاری دەستی) بۆدروستکردنی تویتەر لەلایەن (جاك دورسی) کێشراوە




## یەکە ئیش پێکەرەکانی تویتەر:

بەشێوەیەکی گشتی لەپەرەی تویتەر بۆهەر بەکارهێنەرێك کە خاوەنی پێگەی تایبەتی تویتەر بێت ,ئەم یەکەتایبەتانە دەگونجێنێت لەگەڵ بیبیۆگرافیای بەکارهێنەر :

١- پێگەی کەسی (Profile) کە تایبەتە بەپێشاندانی کەسایەتی بەکارهێنەر و هەموو ئەو زانیاریانەی کە بەکارهێنەر لەکاتی داواکاری تۆمارکردن داوای لێکراوە .

٢-تویت (Tweets) گوزارشتە لەژمارەی تویتکردن (پۆستکردن) و بڵاوکردنەوەی بابەتی تویت .

٣- وابەستەبوونی بەکارهێنەر ( Following) گوزارشتە لە وابەستەبوون یان بەدڵ بوون و بەئاگابوون لە تویتی کەسانی تر .

٤- وابەستەبوون بە بەکارهێنەر (Followers) گوزارشتە لەژمارەی ئەوکەسانەی کە وابەستەن بە بەکارهێنەر .

٥- چوارچێوەی تویت کردن : کە بریتییە لە بۆشاییەك بۆ وەڵام دانەوەی هەر سەرنجێکی تویت .

٦- چاککردنی دەقی تویت ( Retweet) بۆگۆڕین یان چاکردنی تویت دوای بڵاوکردنەوەی .

٧-لیست (Lists) گوزارشتە لە لیستێکی ئامادەکراوی تایبەت بە جێگیرکردن و گۆڕانکاری .

٨- دڵخواز(پەسەند) (Fivorites) بۆ دیاری کردن و جیاکردنەوەی تویتە پێش بەکارهێنان یان بلأوکردنەوە .

٩- پەرەی پەیوەنیکردن (connect)تایبەتە بە چاودێری بەریەککەوتەکانی نێوان بەکارهێنەران وەك چالاك بوون و بەشداری.

١٠- یەکەی دۆزینەوە (Descover) پێگەی تویتەر ڕێگا دەدات بەبەکارهێنانی کە بتوانن بۆئەوزانیاریانەبگەڕێت کە خۆی دەیەوێت (سنوردار) .

١١- نامەناردن (Messanger) بەکاردێت بۆنامەناردنی کەسی و (تایبەت) لەنێوان بەکارهێنەراندا .

١٢- ڕێکخستن (Setting )بۆرێکخستن وجێگیرکردن بەکاردێت [١]

[١] بسمة قائد البناء , هەمان سەرچاوەی پێشوو , ل ٧٧

# بەشی سێهەم

# کاریگەری تۆڕەکۆمەلاّیەتیەکان لەسەر هۆشیار کۆمەلاّیەتی گەنجان

## چەمکی کاریگەری :

ئـەدیبی فەرەنسـی (جـۆرج دیهامـل) دەلّێـت : لەگـەلّ دکتۆرێـك لەبەرەیـەکی شـەڕ یـەکترمان ناسـی , کـە بـەگوێی خـۆیی گـوێی لـە دەنگی تۆپ و نالّەی بریندااران و بێزاری سەربازان دەبوو .ئەم دەنـگ و کارەساتانە هیچ هەستی نەدەبزواند,بەلاّم کـە ئـەم دیمەنـەم کـردە بەسەرهاتێك و بلاّوم کردەوە دکتۆرەکە خوێندیەوە زۆرکـاری تێکـرد بەڕادەیــەك هێنایەگریان,ئەمــە ئەوەدەگەیــەنێت کەســانێك هــەن لەڕێگەی نوسینەوە کاریان تێدەکرێت کە لەڕێگەی بینیەوە ئەم کارە ناکرێت .[1]

وشە و ڕستەکان لەزماندا کاریگەریەکی بەهێزیان هەیە و بۆمەبەستی جیاجیا بەکار دەهێنرێت , وەك ئەوەی لاوێك بەدوای چەند وشەیەکدا دەگەڕێت تاکوو دلّی یارەکەی پیّ خۆش بکات یان هەلّی بخەلّەتێنێت

[1] د.عبدالواحید مشیر دزەیی ,کاریگەری دەروونی لەبواری راگەیاندا , چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی ئاراس , هەولێر , سالّی چاپ ۲۰۰۹ , ل ٤٣

و مامۆستایەکی ئاینی خەڵکی پێ بوروژێنێت بۆ ڕووکردن لەچاکە و دوورکەوتنەوە لەخراپە سیاسەتمەدارێك بۆ کۆکردنەوەی جەماوەر و کارتێکردن لەرەوشت هەروەها بۆ بەدیهێنانی مەرامەکانیان کە مرۆڤی سادەش هەستی پێدەکات .

گرنگی دان بە لایەنی دەروونی زمان , لەسەدەی نۆزدە و بیستدا پەرەی پێدرا لە لایەن زمانەوانانی وەك (گاردنەر, بولەر , ئۆتۆ ئێرنەست , کارینز, .....) ئەمەش بوە رێ خۆشکەرێك بۆ سەرهەڵدانی واتای کاریگەری لای (کرۆس ,لیچ , ئۆلمان ..) هتد . کەپەیوەستە بەباری دەروونی ( نێرەر).[1]

فەرهەنگی کامبرێج بەم جۆرە باس لە چەمکی کاریگەری دەکات و دەڵێت : کاریگەری ئەو هێزەیە کە لەرێگەیەوە هەوڵ دەدرێت گۆرانێك لە هەلسوکەوت و شێوازی بیرکردنەوەی کەسێك بکرێت .[2]

لەئێستادا بەهۆی کاریگەری میدیای نوێ و یاخوود سایت و تۆرەکۆمەلآیەتیەکان تەنانەت تەلەفزیۆن و رۆژنامەکان پێگەی تایبەت بەخۆیان هەیە,کە بابەت و زانیارییەکانی خۆیان بلآودەکەنەوە ,ئەمەش بایەخ و گرنگی زۆر و کاریگەری

---

[1] د.عبدالواحید مشیر دزەیی ,هەمان سەرچاوەی پێشوو , ل ٤٩

[2] https://dictionary.cambridge.org/us/dictionary/english/influence لەبەرواری ١٤\٢\٢٠١٩

تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان و ئینتـەنێت دەردەخـەن ,هـەر لـەو ڕێگەیـەوە دەتوانن سەرنج و تێبینیەکانی هاولآتیان بزانن . [1]

## جۆرەکـانی کاریگـەری کـەناڵ یـان ناوەنـدەکانی ڕاگەیانـدن لەسەر هۆشیاری گەنجان :

أ – **کاریگەری مەعریفی** : مەبەسـت لێـی زانینـی پەیوەنـدی نێـوان کارلێك یان کردەی پەیوەندی کردن و زیادبوونی هۆشـیاری مـەعریفی و ڕۆشنبیرییە لەژینگە سیاسیەکەیدا کە هاوکێشەیەکی گران هەیە کە بڕیار لەسەر ئەوە بدات ڕۆشنفکری ئـەلیکترۆنی بەشـێکە لـە تـەواوی بابەتەفێرکارییـــەکانی مرۆڤایـــەتی ,چـــونکە لـــە ڕێگـــەی تۆرەکۆمەلآیەتیەکان جۆر و کوالیێتی کاریگەریەکان زۆرتر بوە یاخوود بەرەو جیهانگەرایی دەڕوات .

ب – **کاریگــەری ســۆزداری** : مەبەســت لێــی ڕادەی کاریگــەری ناوەنـدەکانی ڕاگەیاندنـە لـە دەسـت نیشـانکردنی هەڵوێسـتەکان و دروســـت کردنـــی ئـــەو ئاڕاســـتانەی پـــەرەی ســـەندووە بەرامبەرکاریگەریەکانی میدیا یان جۆر و کوالیێتی کەناڵەکە .

---

[1] شیما بلونس ,دور وسائل الاعلام والاتصال الجدیدة فی التغیرات السیاسی ,رسالة ماجستر ,جامحة الجزائیر , غیر منشور , ٢٠١٥ ,ل ٢٥

ج – **كاريگـەری رەفتـاری** :مەبەسـت لێـی زانینـی پەیوەنـدی نێـوان پێكداداان و بەركـەوتنی ناوەنـدەكانی راگەیانـدن و بەشـداری كردنـی راسـتەقینەیە لەپرۆسەوچـالاكیە گشـتیەكان,كەئەم قۆناغـەش بەگرنگترین قۆناغەكاریگەرەكانی راگەیاندن دادەنرێت .[1]

دەربارەی ئەم بابەتە بۆچوون زۆرە هەروەك زانای كۆمەڵناس (ملفن دوفلور) پێی وایە كە لەرێگەی كاریگەریـەكانی راگەیانـدن دەتوانرێـت كۆمەڵگا هێندەی تر ئاشنا بكرێت بە سیستمی سیاسی و كۆمەلأیەتی و ئـابوری ,جگـە لـەو بـوارەی كـە خـەڵك خـۆی تێیـدا دەژی بـەهۆی كاریگەریـەكانی میـدیاوە پشـتی تـەواویش بـە راگەیاندنـەكان دەبەستێت[2]

هەروەها (هابەرماس) لەو كۆمەڵناسانەیەكە بایەخێكی زۆر بە میـدیا و كاریگەریەكانی میـدیا داوە و پێـی وایـە :لەگـەڵ ئـەوەی كـە میـدیا مەرامی سەرەكی بریتیە لە بازرگانی و سەپاندنی ئایـدۆلۆژیای گـروپ یـان ناسیۆنالیسـتی نەتـەوە یـان تـاك فكـری ,لەگـەڵ ئەوەشـدا دەرفـەتێكی باشـی رەخسـاندووە بـۆ گۆڕینـەوەی بـیر ورا و دیـالۆگ

[1] محمد بن مسعود البشير ,سەرەتایەك لەپەیوەندی كردنی سیاسی ,و.مەم بورهان قانع ,چاپخانەی بیایی ,چاپی یەكەم ,٢٠٠٧,ل ١٤٥

[2] ئاریان فەرەج ,بەرپرسیارێتی كۆمەلأیەتی رۆژنامەنووس , چاپخانەی رۆشنبیری ,هەولێر ,ساڵی ٢٠١٣ ,ل ٥٦

هەروەها لەدیدی (مانوێل کاستلەن) ئەوکەڵەکە بوونە ئابوریەی کە جیهان پێیدا تێپەر دەبێت و چەندین پرۆژەی گەورەی جیهانی بازرگانی دروست بوون بەهۆی کاریگەری میدیایە بەگشتی و بەتایبەت میدیای ئۆنلاین .

## هۆشیاری : CAUTIONING

هۆشیاری یاخوود بەئاگایی بریتیە لە هەبوونی باکگراوندێکی مەعریفی دەربارەی زانستێك یان بابەتێك کە زادەی بەدواداچون و خوێندنەوە و گوێ گرتنە بەشێوەیەکی هەرەمەکی لە زاکیرەی مرۆڤدا لەگەڵ گۆڕانی بەردەوام دەمێنێتەوە بۆنموونە فەرهەنگی (الجامع المعانی) پێی وایە کە هۆشیاری بریتیە لە : هەست کردن بەڕاستیە سەلمێندراوەکان بەرامبەر بەزانستێك ,هەروەها وتراوەکە بریتیە لە هونەری مامەڵەکردنی دروست لەگەڵ کرۆکی بابەتێك بەهەبوونی باکگراوندێکی هۆشمەند.[١]

---

[١] https://www.**almaany.com**/ar/dict/ar-ar/% AA%D%D٨٪A٩/ لە ٢٠١٩\٢\١٨

هـەروەها لـە فەرهـەنگی THE FREE DICTIONARY دا هـاتوە کە هۆشیاری بریتیە لە : هەبوونی ئاگـایی کەسـێك دەربـارەی شـتێك یان بابەت یان زانستێك دەربارەی هۆکار یان ئەنجامی روداوێك .[1]

هەروەها گۆتەی شاعیر و فەیلەسوفی بەناوبانگ دەڵێـت :هـیچ کـەس ناتوانێت وەك خۆمان فریومان بـدات ,ئەگـەر پێچـەوانەی ئـەم وتەیـە وەربگـرین ئـەوەمان بۆدەردەکـەوێت کـە هـیچ کـەس وەك خۆمـان ناتوانێت برەو بەهۆشیاری فکری و سیاسی کۆمەڵایەتی خۆمان بـدات بۆیـــە بەشـــێکی زۆر لـــە بیرمەنـــدانی بـــواری زانســـتی هۆشـــیاری دەبەسـتنەوە بـە فەلسـەفەی (پراگمـاتیزم) یـاخوود (الذرائعیـة) کـە رەوتێکی فەلسەفیی و فکرییـە و لەلایـەن زانایـانی ئەمـەریکی (ولیـام جێمس) لـە (١٨٤٢-١٩٠٧) هـەروەها ( چـارل سـاندریس پێـرس) لـە (١٨٣٩-١٩١٤) هەروەها (جۆن دیوی) لە (١٨٥٩-١٩٥٢) دامەزراوە کـەپێیان وایـە :مەعریفـە یـاخوود هۆشـیاری حەقیقـەتی هەیـە بـەڵام بەگشتی و کامڵی لەپرۆسەیەکی پراکتیکیدا دەردەکەوێت .

هـــەروەها ( رۆرتـــی )یـــەکێکی ترەلەئەنـــدامانی ئـــەو گروپـــە فەیلەسوفانەی کەسەربەرەوتی پراگماتیزمەیە و پێی وایە

---

[1] https://www.thefreedictionary.com/caution لە ٢٠١٩\٢\١٨

کـە : مەنفەعـەت رەگـەزێکی گرنگـە لـە هۆشـیاریدا هـەروەها هـەر پرۆسـەیەك سـوودی هـەبوو بـۆت ئـەوە ئـەو پرۆسـەیە بریتیـە لـە هۆشیاری .[1]

## هۆشیاری کۆمەڵایەتی : SOCIAL CONSCIOUSNES

هۆشـیاری کۆمەڵایـەتی یـان (کـان چسـنێس ) لەبنەڕەتـدا وشـەیەکی یۆنانیە کە گوازرشتە لە ئاسـتی ژیـری و عـەقلی مرۆڤـەکان و ئاسـتی درك کردن بەرامبەر بـە شـتەکانی دەور و بـەر و ژینگـە جیاوازەکـانی بڕیاردان  بەرامبەر بە کات ,شـوێن , کەسـەکان , یـاخوود بریتیـە لـە کاردانەوەی عقلی مرۆڤ کەگوزارشتە لە چۆنیەتی مامەڵـەکردن لەگـەڵ دۆخی جیـاواز کـە پێگەوکەسـایەتی و ناسـنامە و ئاسـتی رۆشـنبیری کەسـەکان دەردەخـات دەربـارەی زانسـت یـان بابـەتێك کـەزۆرجار ئەوکەسەبەوهۆشیاریە دەناسرێتەوەبەباش یان خراپ مامەڵەکردنی.[2]

لەڕووی فەلسەفیەوە هۆشـیاری کۆمەڵایـەتی بریتیـە لـە : کـرۆك یـان جەوهــەری مرۆڤایــەتی کــە چــەمکێکە جیــای دەکاتــەوە لــەباقی

---

[1] نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد , فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی و ڕەخنەیی , چاپخانەی بینایی , ساڵی ٢٠١١,چاپی یەکەم ,ل ٣٤٢

[2] http://www.moqatel.com/openshare/Behoth/Mnfsia١٥/Socia/لە ٢٠١٩\٢\٢٢

دروستکراوەکانی تر چونکە بە هۆشیاری کۆمەلأیەتی دەتوانێت گرەو ویاری سەرکەوتن و روخانی ژیانی خۆی بباتەوە.[1]

دوای خستە بەرباسی چەمکی هۆشیاری لەدوتوێی دیدی چەند بیرمەندێکی بوارەکە من وەك توێژەر پێم وایە هۆشیاری ئەو کەوانەیەیە کە من لەوی دی جیادەکاتەوە ئەو هێڵە زانستی یان کلتوری یان هەر پێناسێکی تری کۆمەلأیەتیەیە کە تاك دەتوانێت بۆمەبەستی بەرز راگرتنی پێگە و کەسایەتی خودی خۆی و چواردەورەکەی سودی لی ببێنێت ,بەدیوێکی تر هۆشیاری وەك فرۆید دەلێت ئەوەیە کە گرنگی بە دەرکەوتن دەدات هۆشیاری بە باکگراوندی مرۆڤایەتی هەژمار دەکات,یاخوود هۆشیاری بریتیە لە شیکردنەوەی دەروونی بۆهەموو ئەو شتانەی کە بایەخیان هەیە دەزانرێت کەی چۆن و بۆچی بەکاری دەهێنێت .[2]

---

(١) [1] https://ckb.wikipedia.org/wiki/%D ٩ لە ٢٠١٩\٢\٢٣

[2] عبدالموتەلیب عبدالله,خوێندنەوەی پەراوێز پەراوێزی خوێندنەوە , چاپخانەی رۆژ هەلأت ,هەولێر , چاپی یەکەم , ساڵی ٢٠١٢ , ل ١٢٥

## ڕاگەیاندن و هۆشیاری کۆمەڵایەتی :

راگەیاندن بەشێوەیەکی گشتی لەسێ ڕووەوە کاریگەری گرنگی هەیە لەسەر هۆشیاری , کەگرنگترین هۆکاری کاریگەری گرنگی دانی خوودی راگەیاندنە بەزانستی هۆشیاری گشتی لەبەرئەوەی کە میدیا دەتوانێت رۆڵێکی کاریگەری هەبێت لەسەر بونیادی کۆمەڵگای هاوچەرخ یان بەپێچەوانەوە, میدیا دەتوانێت بەویستی خۆی کۆمەڵگا ئاراستەبکات.

هەمووپەیامێکی میدیایی بە جۆرێکی ڕێژەیی بەشدارە لە هۆشیاری کۆمەڵگا , هۆکاری دووەم بریتیەلە رۆڵی میدیا لە ناساندنی ڕەهەندە کۆمەڵایەتیەکان بە تاك , کە ئەمەش نوێبوونەوەی کۆمەڵگا و هۆشیاری دەربارەی زانست و داهێنانی نوێ بەکۆمەڵگا دەبەخشێت هۆکاری سێهەم لە کاریگەریەکانی میدیا لەسەر هۆشیاری بریتیەلە بەشداری میدیا بۆ تێگەشت لەرەهەندە(دینی,سیاسی,ئابوری )یەکان کە راستەوخۆ ئەم چەمکانە بەستراونەتەوە بەژیانی تاك و هۆشیاری گشتی تاك دەگۆڕن .[1]

ئەگەر بەشێوەیەکی گشتگیرتر باس لە کاریگەریەکانی میدیا بکەین دەردەکەوێت کە کۆمەڵگا تەواو دەکەوێتە ژێرکاریگەریەکانی میدیا

---

[1] د. علی محمود ابولیلة , الاعلام والمجتمح ,قرطبة للنشر والتوزیع ,الریاض ,٢٠١٤ ,ل ٥٨

هـــەر لـــە بـــەکارهێنانی دەســـتەواژە تـــاکوو کاریگـــەری رۆشـــنبیری (Cognitive Effects ) و کاریگـــەری ویـــژدانی ( Affective Effects )وکاریگەری هەڵسوکەوت ( Behavioral Effects )

کاریگـــەری رۆشـــنبیری گوزارشـــتە لەهـــەموو ئەوپەرچـــەکردارانەی کـــە لەدەرئەنجامی کـردەی میـدیایی بـۆوەرگر هەسـتیان پێـدەکرێت کـە پەیامەکـــەیان ,پـــەیامێکی رۆشـــنبیری ئامـــادەکراوی ئاراســـتەکراوە بەمەبەستی گۆڕینی هەڵسوکەوت یان کـرداری وەرگـری بـەئامانجکراو ئاراستەدەکرێن و مۆرکێکی رۆشنبیری هەیە .

## ئینتەرنێت و هۆشیاری کۆمەڵایەتی:

زانین هێزە , لەرێگەی تەکنیکی زانیاریەکان وپەیوەندی کردنەکانەوە بەتایبەت ئینتەرنێت , توانراوە نایابی وباشی زانینە ئاڵوگۆڕکراوەکان زیـاتر بکرێـت و بەتونـدی سروشـتی پەیوەندیـەکانی نێـوان تاکـەکان بەیـــەکتری و نێـــوان تاکـــەکان و دامـــەزراوەکان و کۆمەڵگـــەکانیان دەگۆڕێـــت , ئـــەوەش لـــە ئـــەنجامی دابـــەزینی تێچـــوو کـــاتی بڵاوبوکردنەوەی زانـین وبەدەسـتهێنانیان بەئاسـانی بەدرێـژایی رۆژ و هەفتە , یان وەك پێی دەوترێت (٢٤) کاتژمێر لەهەر رۆژێـك و لەهـەر شـــوێنێك بـــەبێ تێچـــوون و مانـــدوبوونی گواســـتنەوە , لەســـۆنگەی ئەمەشدا گۆرانکاریەکی خێرا بۆ "کۆمەڵگەی زانینیانە" ی دیار دێتـە

ئاراوه , بەجارێك كە دەبێتە هۆی هاتنە كایەی زێدە بەهایـەكی بـەرز رۆڵـی زانیاریـەكان , وەك ئامرازێـك جـەخت لەسـەر بەرزكردنـەوەی ئاسـتی ژیـان و بڵاوكردنـەوەی هۆشـیاری رۆشـنبیری ئینتـەرنێت دەكەنـەوە , لەئـەنجامی ئـەو پەرەسەندنانەشـدا زانیاریـەكان بـە ئاسـتێكی بـاش و نایـاب كەوتنـە بەردەسـتی خـەڵكانی تایبـەت و گشتیش , توێژینەوە هاوچەرخەكان جەخت لەسـەر ئـەوە دەكەنـەوە كـە بـەكارهێنانی پۆسـتی ئـەلیكترۆنی بەشـداری لەكەمكردنـەوەی گۆشـەگیری نێـوان بەساڵاچـوان و پەككـەوتوان و هانـدانیان بـۆ هەڵسوكەوت و ئەنجامدانی رۆڵی كۆمەڵایەتی نوێ لەمیانی كەناڵەكانی پەیوەندی كردن دەكەنەوە پێگە تـەرخانكراوەكانیش بـۆ گفتوگـۆ لەسـەر ئینتـەر نێـت , یارمـەتی چـەندین دەسـتەیان داوە بـۆ چارەسـەركردنی گرفتـەكانیان , وەك ئالودەبوەكـانی مـادە هۆشبەرەكان , ئەوانەی نەخۆشی دەرونیان هەیە.

هەروەها سـەبارەت بـەبونیادی كۆمـەڵگامان , ئینتـەرنێت كاریگـەری زۆر لەسـەر ئاسـتی گـوزەران و چارەسـەركردنی گرفتـەكان دەكـات بونیادی كۆمەڵگاكانیش بەوە پێناسە دەكرێن كـە " كۆمـەڵێك یاسـاو پێڕەو و داب و نەریتێكن , سەقامگیری و بـوونی كۆمـەڵگا دەپـارێزن بریتیشن لەزمان و ئاین وناسنامەی رۆشنبیری و پەیڕەوگەلە یاسـایی

و سیاســـــی ئـــابوری و ئاسایشـــیەکان و تـــەواوی ڕەهەنـــدە کۆمەڵایەتیەکانی تر .

دەربارەی شوێنەوارە ئەرێنیەکانی تەکنەلۆژیای پەیوەندی کردن و ئینتەرنێتیش لەسەر بونیادی کۆمەڵگەکان , هەندێك کەس وای دەبینن کە یارمەتی بەستنەوەی کۆمەڵگاکان و نزیکخستنەوەیان دەدات , چونکە لەڕێگەی پۆستی ئەلیکترۆنیەوە , گفتوگۆی بەکۆمەڵ نەشونما دەکات وپاڵپشتی کارلێکە ئاست جیاوازەکانیش دەکات , پاشان یەکانگیری کۆمەڵایەتی بەهێزتر دەکات ,هەروەها ئینتەرنێت کار لەسەرچاککردنی باری ژیان و گوزەرانی بەکارهێنەرانیی دەکات بۆنموونە لە سۆدان ئینتەرنێت دەرگای بژێوی بۆزۆرێك لە لاوان کردۆتەوە .

بێگومان هەموو جۆرەکانی پەیوەندی و ئەرکەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان دوولایەنە کاریگەری خۆیان هەیە لەسەر ڕەفتاری بەکارهێنەرانیان بەتایبەت گەنجان [١]

---

[١] د. بەهادین احمد , هەمان سەرچاوەی پێشوو, ل ٩٠

## تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و هۆشیاری کۆمەڵایەتی :

ژیـانی کۆمـەڵگا دوای شۆڕشـی پیشەسـازی و گۆڕانـە زانسـتی و تەکنەلۆژیەکان بۆتە کۆمەڵگای ئەلیکترۆنی , یان ئینتەرنێتی , ئەگەر بپرسین دوای ئەوە چیتر ژیانی کۆمەڵگا داگیردەکات ؟ دوای دروست بونیـان بـەجارێك بڵاوبۆتـەوە کـە کـەم کـەس هەیـە راسـتەوخۆ یـان ناراستەوخۆ نەبوبێت بـە شـوێنەکەوتووی تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان هـەم هەڵسوکەوت هەم فکر هەم کار و کاردانـەوە, بەشـێوەیەکی گشـتی و هەرچـۆنێك بێـت کاریگەریـە کۆمەڵایەتیـەکانی تۆڕەکـانی پەیوەنـدی بوونی هەیە لەهەموو بوارەکانـدا و زۆر بـەڕوونی هەسـتی پێـدەکرێت بۆنموونە کاریگەری تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان لـە ناوەنـدەکانی خوێنـدن بەتایبـەتی خوێنـدنی بـاڵا و سـەنتەرەکانی توێژینەوەزانسـتیەکان دیـارە ,چـونکە بەشـێوەیەکی فـراوان بەکارهێنـەران دەتـوانن بۆدەستکەوتنی ماددەی زانسـتی و بڵاوکردنـەوەی نووسـین و بابەتـە پەیوەندیدارەکان تۆڕی کۆمەڵایەتی بەکاربهێنن.

یەکێکی تر لە کاریگەریەکانی بریتیە لە کاریگـەری فێربـوونی زمـان بۆ نموونە بـەتۆمارکردنی زمانێـك لـەناوتۆڕ و پێگـەکان بەخێراییـەکی زۆر دەتوانیـت بۆهـەرزمانێك کـە بتـەوێت وەرگێڕانـی بـۆ بکرێـت ئەمـەش وادەکـات کـە رۆشـنبیریەکی بـاش کەڵەکـەبێت لـەڕووی

زمانەوانیەوە بەتایبەت بۆ کەسانێك پێویستیان بەسەرچاوەی گرنگی زانستی هەیە, بەتایبەتیتر بابەتە فکری و فەلسەفیەکان ,کە زیاتر بەزمانی ئینگلیزین بۆ نەتەوەکانی تر تێگەشتنی ئەستەمە, بەڵام پێگە ئەلیکترۆنیەکان تارادەیەك ئەم کێشەیەی نەهێشتووە .

یەکێکی تر لە کاریگەریەکان لەسەر کۆمەڵگا بریتیەلە پێدانی هۆشیاری بەچینی ژنان , منداڵان , گەنجان , هەروەها ناساندن و دەرخستنی کاروچالاکیەکانی رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ و رێکخراوە ناحکومیەکان و گروپە ژیان دۆستەکان , کە رۆڵی زۆریان هەیە لەسەر پاراستنی پیرۆزیەکانی ژنان و دیاری کردنی گرفتەکانیان باڵنەرێکی گرنگی ئافرەتان بووە لە گەیاندن و باسکردنی بەشێك لە گرفتەکانیان , ژن وەك دایك گاریگەردەبێت بە تۆرەکۆمەڵایەتیەکان و دواتر تاك بەتاکی کۆمەڵگا لەرێی دونیا بینی دایك کە بەکارهێنەری بەشێکی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانە بارگاوی دەکرێن بە کاریگەریەکان.

تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان وەك بەشێکی جیانەکراوە لەبەکارهێنەرانیان هەژماردەکرێن , لەبەر ئەوە گومانی تێدانیە لەرووی فکری و هەڵسوکەوتەوە کە زۆرجار بە (ئازادی ئەلیکترۆنی ) ناوزەند دەکرێن تەنانەت پۆشینی جل و بەرگ و مۆدێلاتی نوێ و کڕین و فرۆشت بە

بەشێکی زۆر لە کالاَ و پێداویستیەکان , کە ڕاستەوخۆلە دەرئەنجامی کاریگەری تۆڕەکۆمەلاَیەتیەکانەوە سەرچاوەی گرتوە .

یەکێکی تر لەکاریگەریەکۆمەلاَیەتیەکانی تۆڕەکۆمەلاَیەتیەکان بریتیە لەوەی کە هانی کۆمەلَگا دەدات تاوەکوو بزانن بنەچە و ڕەگ و ڕیشەی نەتەوایەتی و خێزانیان چیە وکێیە؟ کەباش یان خراپ کاریگەری هەستی نەتەوایەتی و دەروونی دروست دەکەن , یەکێك لەهەرە کاریگەرترین کاریگەریەکانی تۆڕەکۆمەلاَیەتیەکان بریتیە لەوەی کە کۆمەلَگا و تایبەتمەندیەکانی کۆمەلَگای گۆڕی بۆ تایبەتمەندی تاك , هەلَسوکەوتە بەکۆمەلَەکانی گۆڕی و سیفەتی تاکی پێدان ,ئەوەش ڕەهەندە کۆمەلاَیەتیەکان کالَ دەکاتەوە و گۆشەگیری و کەمتەرخەمی کۆمەلاَیەتی بەرهەم دێنێت .[1]

ئەوبابەتانەی سەرەو و داتاکان کەلە دەرئەنجامی چەندین توێژینەوەی زانستی دەستکەوتوون و دەرخەری ئەوەن کە تۆڕەکۆمەلاَیەتیەکان کاریگەریەکی زۆریان هەیە لەسەر کۆمەلَگا بەتایبەت گەنجان , کاریگەریەکانیش بەڕێژەی جیاوازی (جوگرافی کۆمەلاَیەتی ) دەگۆڕێن , هەروەها ئەوەی دەردەکەوێت

[1] جمال سند السويدى , وسائل التواصل الاجتماعى ودورها فى التحويلات المستقبلية من القبيلة إلى الفيسبوك , چاپی یەکەم , ٢٠١٣ , ل ٦٠

کاریگەریەخراپــەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیــەکان زیــاترن وەك لــە لایەنــە ئیجابیەکانی.

بۆنموونە بەپێی توێژینەوەیەك کـە لەولایەتەیـەکگرتوەکانی ئـەمریکا لــە ســەر (٧٥٠) کــەس ئــەنجام دراوە و لــەگۆڤاری family pc دا بلاوکراوەتــــەوە دەرکــــەوتووە لــــە٧٠٪ی بەکارهێنــــەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتیــەکان دووچــاری داڕووخــانی دەروونــی و ئاکــاری بوونەتەوە ,هەرلەهـەمان توێژینـەوەدا ئاماژەبـەوە کراوەهۆکـاری ئـەو کاریگەریەخراپانـەی تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان بریتـی بـووە لـە نـەبوونی هۆشیاری بـەکارهێنانی تۆڕەکـان, هـەروەها بـەپێی بەدواداچـونێکی کۆمپانیـای (pow distribution) بـەریتانی کـە کۆمپانیایـەکی تایبەتەبە زانیارییە ئەلیکترۆنیەکان ئاماژە بەوە دەکـات کـە لـەدوای چـــینی گـــــەنجان منـــــداڵ دووەم نـــــێجیری دەســـــتی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانن.[1]

هەروەها دەتوانین لایەنەخراپەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بەهـەمان قەبارەی لایەنەباشەکانی سـەیر بکـەین , لەسـەروو هەموویانـەوە کـە (بۆتــە لێکهەڵوەشـێنەری کۆمـەڵگا) بـەو مانایـەی کـە وەك مارشــاڵ ماکلۆهـان دەڵێـت (جیهـان بۆتـە گونـدێکی بچـووك) بـەڵام گونـدێکی

[1] عامر وهاب غلف العانی , الاعلام ودور فی المعالجة ظاهرة الارهاب والموقف من المقاومة , دار حامد للنشر , عمان , ٢٠١١, ل ٧٥

ئـەلیکترۆنی بـەبی هەسـت کـردن بـە یـەکتر ,کۆمـەڵگا پێـك هاتـەی چەندین ئەزموونی مرۆڤەکانە کە تێکـڕا بەهـەموو جیاوازییـە فکـری و نەتەوەیی و زمان و ڕەگەز لەچوارچـێوەی  سیسـتمێکی دیـاری کـراو دەژین , دەکرێت کۆمەڵگا ئەگەر بەم جۆرە گەشـەکردنە ئەلیکترۆنیـە بـڕوات لــە چــەند ســاڵی داهــاتوودا سیســتمی مــانگی دەســتکرد و ئینتەرنێت ببڕێـت ئـامرازێکی تـری بێتـە کایـەوە کـە چـەند هێنـدەی تۆڕەکۆمەلأیەتیەکان  لەسـەر کۆمـەڵگا و هـەموو ڕەهەنـدەکانی ڕەگ دادەکوتن.

بەگشــتی ئــەو کاریگەریانــەی کــە ئاماژەمــان پێــدان بەشــێکن لەکاریگەریــەکان کــەزۆرێك لەبەکارهێنــەرانی تۆرەکۆمەلأیەتیــەکان کاریگەربوون پێی , بەلأم سەرنجی زیاتر لەسەر چینی گەنجانە لەبەر ئەوەی زیاتر و بەبلأوتر ئەم تۆڕانەبـەکاردەهێنن  لەبەرامبـەردا زیـاتر کاریگەر دەبن , کەواتا تۆڕەکۆمەلأیەتیەکان وەك بەشێك لە بونیـادی کۆمەلأیـەتی  کۆمـەڵگا سـەیردەکرێت بەگشـتی و گـەنجان بەتایبـەتی چــونکە ڕوونــە گــەنج داینــەمۆی فکــر و شــۆڕش و هــەموو جوڵــە گشتیەکانی کۆمەڵگان .

## کاریگەری تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و بونیادی کۆمەڵایەتی :

دیاری کردنی پێناسەیەکی تەواو بۆ چەمکی بونیادی کۆمەڵایەتی لای زانایانی بواری ئینترۆپۆلیژیای مرۆڤ بە ئەستەم دادەنرێت , لەبەر ئەوەی چەند لایەنێك لەخۆ دەگرێت, بەڵام دەکرێت سەرنجی زانای بەناوبانگ (هۆبێرت سبنسر) بە پێناسەیەکی نزیك لە گشتگیری وەربگرین دەربارەی بونیادی کۆمەڵایەتی کە پێی وایە (بونیادی کۆمەڵایەتی وەك جەستەیەك وایە کەبۆبەردەوامی ژیان رۆژانە پێویستی بەچەندین جۆر لەخواردن و خواردنەوە هەیە هەریەك لە خواردن و خواردنەوەکان بۆ بەشێکی دیاری کراوی جەستە بەسوودە بەش بە بەش دەبن بە بونیادێکی خۆراکی بۆ بەردەوامی ژیانی ئەو کەسە ,بەهەمان شێوە بونیادی کۆمەڵایەتی سەرەتا لە خێزانەوە دەست پێدەکات ,چونکە خێزان هەرکات تاکێکی پەروەردەکراوی پەسەندی بەرهەم هێنا ئەوتاکە دەبێت بە بەشێك لەوکۆمەڵگایە دواتر دوای وەرگرتنی ئەرك لەکۆمەڵگا بەشێوەیەکی رێك بوونیادی کۆمەڵگا بەردەوام دەبێت ,شانبەشانی گۆڕانکاریەکان وهەڵسوکەوتکردن لەگەڵ شتەنامۆکان) .

هەروەها دەکرێت لەبونیادی کۆمەڵایەتی هەموو ئەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیانە بەشداربن کە بەردەوام لەکۆمەڵگادا بوونی هەیە

کەواتــە ئەگــەر بونیادنــانی کۆمەڵایــەتی بــە جەســتەیەکی مــرۆڤ بچوێندرێت ,گومـان لەوەدانیـە کـە (خێـزان , قوتابخانـە, سیسـتمی سیاســـی ولأت , میـــدیا ( تۆڕەکۆمەڵایەتیـــەکان) لـــەگرنگترین هۆکارەکانن کە دەتوانن ڕۆڵیان هەبێت لە بوونیـادی هەرکۆمەڵگایـەك بۆنموونە :

دەکرێت تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بە نموونە وەربگرین بـۆ دوو کۆمـەڵگای جیاواز (ڕۆژئاوا — ولأتانی عەرەبی) کۆمەڵگای ڕۆژئـاوا لەبـەر ئـەوەی کـە هۆشـیاریەکی زیاتریـان هەیـە لەسـەر بـەکارهێنان و هەڵبـژاردنی جــۆری تۆڕەکۆمەڵایەتیـــەکان ,دەبیـــنین ڕێـــژەی هەڵســـوکەوتە نەشیاوەکان کاردانەوەمرۆییەکان کـەمترن لەچـاو ولأتـانی عـەرەبی و ئـەو ولأتانـەی کـە لـەقۆناغی گواسـتەوەوەدان , پاشـان بـە پێـوەری هەڵســوکەوت کــە دەبێــت بــە بەشــێك لــە بونیــادی کۆمەڵایــەتی هەڵسـوکەوتی تـاك پێکهاتەیـەکی زۆر گرنگـی پەیکـەری کۆمەڵگایـە لەبـەر ئـەوە دەردەکـەوێت تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان بـوون بەبەشـێك لـە پێکهاتەکانی بوونیادی کۆمەڵایەتی بەتایبەت گەنجان .

## تایبەتمەندیەكانی بوونیادی كۆمەڵایەتی :

١- بوارەكانی ( سیاسی , ئاینی , ئابووری , خێزان , خوێندن و فێركردن , میدیا ) یەكێكن لە هەرە گرنگترین كایە كاریگەرەكان لەسەر جۆر و كوالیێتی بوونیادی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگا.

٢- بوونیادی هەموو كۆمەڵگاكان وەك یەك نین, دەشێت لەرووی جۆر و ئاستی كاریگەریەكان جیاواز بن ,هەروەها جوگرافیا و شارستانیەتی كۆمەڵگاكان هۆكارن بۆ دروست بوونی جیاوازی كۆمەڵایەتی , هەروەها ئاستی فەهم و تێگەشتنی تاك و هۆشیاری بۆ قبوڵكردنی گۆڕانكاریە كۆمەڵایەتیەكان دەچنە چوارچێوەی بوونیادی كۆمەڵایەتی .

٣- بوونیادی كۆمەڵایەتی شێوەیەكی جوزئی هەیە ,بەمانای هەندێك لەپێكهاتەكانی گشتگیرن بۆتەواوی تاكەكانی كۆمەڵگا یان زۆرینەی گونجاوە , بەشێكی تری بۆ چینی جیاواز و ئاستی جیاوازە , بەنموونە ئامانج لە ناردنی پەیامی میدیایی مەبەستدار بۆ چینێكی دیاری كراوی كۆمەڵگایە , بەهەمان شێوە پەخشی یاریەكانی خولی ئەورووپی بۆ گروپێكی تری مەبەستدارە , كەواتە گەنجان وەك زۆرترین بەكارهێنەری تۆڕەكۆمەڵایەتیەكان بریتین لەو چینەی كە بەئامانج گیراون بەمەبەستی ئەوەی كاریگەری میدیای ئەلیكترۆنی لەسەریان ڕەنگ بداتەوە .

٤- هەمەجۆری هۆکارەکانی بوونیادی کۆمەڵایەتی , کۆمەڵگا ویست و داخوازی جۆراو جۆری هەیە وەك باسکرا هەریەك لەژێر کاریگەری بوارێك لە بوارەکان ڕۆڵ دەبینێت , ئەم هەمەجۆریەش وای کردووە بەشێك لە تاك چەند ئەرکێکی کۆمەڵایەتی هەبێت کەهەریەکەیان بۆ بەشێکی پەیکەری کۆمەڵگا سوودی هەیە .

٥- هۆکارە بوونیادنەرەکانی کۆمەڵگا بەردەوام لەگۆڕانکاری و نوێ بوونەوەدان , بەومانایەی دەکرێت ئەمرۆ تاك بەبابەتێکی سیاسی ئاشنا بکرێت دواتر گۆڕانکاری لە هەڵسوکەوتی هەست پێبکرێت , دواتر بوونیادی کۆمەڵگا لەسەر ئەدائی تاك بوونیاد بندرێت, بەلأم ڕەنگە بۆماوەیەکی دیاری کراو بێت ,لەداهاتوودا کاریگەریەکانی هەمان ئەوبابەتەسیاسیە بەرێژەیەکی بەرچاو کەم ببێتەوە , بۆنموونە ئەگەر کاریگەرییەکانی میدیای (خوێندراو- بینراو) لە ١٠ ساڵی رابردوودا بەرێژەی ٨٠٪ بووبێت , لەمرۆدا بەهۆی پەیدابوونی تۆڕی کۆمەلأیەتی کاریگەریەکانی بەرێژەی نیوە زیاتر کەمی کردووە, میدیا وەك پێویستیەك هەر ویستی تاك و کۆمەڵگایە, بەلأم هۆکارەکان و شێوازی پەخش و کەناڵەکان ئاڵوگۆر لەرێژەکەدەکەن ,هەربەپێی توێژینەوەکان

دەردەکەوێت تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و پەخشی ئینتەرنێتی زۆرێك لەبەربەستەکانی بڕیوە کە میدیای کلاسیك نەیتوانیوە بیبڕێت [1]

## گەنج (کەسایەتی ) (چەمك) :

دەمەوێت لەبارنەی باس کردنی گەنج بە وتەیەکی فەیلەسوفی جیهانی سوکرات کە لەزاری ئەفلاتونەوە لەکتێبی کۆمار بۆمان باس دەکات دەست پێ بکەم کە دەربارەی گەنج دەڵێت : مرۆڤەکان کاتێك رۆحی گەنجییان لەبەر دەستدایە درێغی لەهیچ هەوڵ و تەقەلایەك ناکەن ,واتا زیادەڕەوی بە بوێری و سەرپێچی بە ئازادی و دەست بلاوی بە شێردڵی و دەمڕوتی بەئازایەتی دادەنێن , بەم جۆرە گەنج لە سروشتی سەرەکی خۆی کە خووی بە ئارەزوە پێویستیەکانی خۆی گرتوە لادەدات و ئازادی و ئارامی کەناپێویست و بێ سوودن بە رەوتی خۆیان دەزانن. [2]

ئاشکرایە کە قۆناغی گەنجێتی یەکێکە لە گرنگترین و ناسکترین قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ, چونکە پردێکە و دەبێتە هۆی گواستنەوە لەقۆناغی منداڵی بۆ قۆناغی کامڵی و پێگەشتن . واتا لەقۆناغی پشت

---

[1] بسمة قائد البناء , تويتر والبناء الاجتماعي والثقافي لدى الشباب , دارالفارس للنشر , الاردن, ٢٠١٤, ل ٩٩

[2] ئەفلاتوون , کۆمار , و. سۆران عمر,ڕێبوار قارەمان ,مهدی حسن چۆمانی , چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ,هەولێر , چاپی یەکەم , ساڵی ٢٠٠٦ , ل ٤٠٨ .

بەستن بەکەسانی دیکە بۆ قۆناغی پشت بەستن بە خود و بوون بە خاوەنی شوناس و کەسێتی .

قۆناغی گەنجی سەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤێکە کە گۆڕانکاری جەستەیی و دەروونی و ژیری تێدا روودەدات و هەنگاوەکانی یەکەمین خەملاندن و دەستەبەر بوونی کەسێتی و شوناسی مرۆڤەکان دەست پێ دەکات . کەبەشێوەی خەملێنراو تەمەنی گەنجی لە (١٢ بۆ ١٨ ) ساڵی دەست پێدەکات .

بەشێوەیەکی گشتی گەنجێتی بریتیە لە خودناسین و نمایشکردنی کەسێتیەك کە تایبەتە و جیایە لە منداڵی و لە سەردەمی پیری . [١]

بۆیە سەردەمی گەنجێتی ماوەیەکی کاتیەو لەگەڵ هەموو گۆڕان وهاوکارە ژینگەیی و خێزانی و پەروەردەیەکان ویستی خودی رۆڵێکی گرنگی لەدروست کردنی گەنجدا هەیە وەك سمکۆخانی شکاك دەڵێت : مرۆڤ ئەوەی دەیەوێت تەنها بەهەوڵدانی خۆی پەیدای دەکات . [٢]

---

[١] حەمەی ئەحمەدرسول ,خوێندنەوەی سۆسیۆلۆژی بۆ ژن گەنج منداڵ,چاپخانەی یاد,چاپی یەکەم ساڵی ٢٠١٣, ل ٥١

٢ سەید کەمال ئیبراهیمی,سمکۆ,چاپخانەی لەریا,سلێمانی,چاپی یەکەم , ساڵی ٢٠١٢ , ل ١٤٥

گەنج ئاماژەیە بە قۆناغێکی فیزیکی لەژیانی مرۆڤدا , بەزەرورەت ئاماژەشە بۆ ئەو چالاکی و بزێویەی قۆناغەکە لە سلوك وشێوەی بیرکردنەوەی کەسەکاندا دەریدەخات , هەرچەندە لەپۆلێنکردنی سلوکدا ئەم دوو ئاماژەیە واتا "گەنج بوون و چالاك بوون" پەیوەستی میکانیکیان لەدەستداوە و مەرج نیە گەنجێتی بەمانای فیزیکی دەلیل بێت لەسەر ئەکتیڤێتی بەڵکو دەشێت شێوە سلوکی گەنجانە لەوکەسانەش ببینرێت کە بەفیزیك پیرن. بەڵام هەمیشە گەنجان لەو توێژە کۆمەڵایەتیەن کە چاوەڕوانی گۆڕانکاری گەورەیان لێدەکرێت و بەردەوام ئومێدی گۆڕانن بۆ زۆرێك لە بیرمەندان و شۆڕشگێڕان و خەڵکانی سیاسەتمەدار ئەوەی وای کردوە کە گەنج مورادف بێت لەگەڵ چەمکی "گۆڕان" بریتیە لە قبوڵ نەکردنی ئێستا و هەوڵدان بۆ گۆڕانکاری لەداهاتوودا لە زۆربەی سەردەم و کۆمەڵگاکاندا ئەم وتەیە دروستە و یەکلایی کراوەتەوە .[1]

گە نج یەکێە لە و کائینانەی تائێستا لە کۆمە ڵگای ئیمە دا پەراوێز خراوەو بە ردەوامیش پەراوێز دە خرێت,هە م لە لایە ن خێزان و کۆمە ڵگە وە هە م لە لایە ن دەسەڵات و حیزبەکانەوە ، ئە وەی کە گە نجی لە سە ر پێی خۆی هیشتۆتەوە تە نها ئیرادە ی خۆیە تی

---

[1] ئاوات عبدالله , سیاسەت و بەرپرسیارێتی , چاپخانەی رەنج , چاپی یەکەم , ساڵی ٢٠٠٧ , ل ١١

هه رئه مەش ده بێته هۆی ئه وەی گه نج شوناسێکی هـه بێـت ئـیتر ئه وشوناسەگوزارشت لەهەرشتێك بكات ئەوەژیانی گەنجی کوردە . [1]

## جۆری کاریگەری تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان لەسەر گەنجان :

١-لەڕووی ئایدۆلۆژیەوە هەندێك لەگەنجان دەکەونـە ژێـر کاریگـەری گروپ وتاقمی توندرەواکان و فکرە پـەرش و بڵاوەکـانی دونیـا کـە ڕەنگـە جگـە لـە خۆخەسـارکردنێکی بـێ مانـای گـەنجان هیچـی تـر نـەبێت،، بـەکارهێنانی تۆرەکۆمەڵایەتیـەکان دواتـر ئاشـنا بـوون بـە ڕێگاکـان ,پاشـان لەدەرئـەنجامی ئـەو کاریگەریانـەوە چـونەتە ریزەکانی گروپ و تاقمە جۆراو جۆرەکان ,ئەمە بۆ هەموو دۆخـەکانی تری ژیانی گەنج بەشێوە و کاریگەری جیاواز بـوونی هەیـە ,هـەروەها کاریگەربوونی گەنجان بـە فکـرو و هەڵسـوکەوت و تەنانـەت پۆشـینی جـل و بـەرگی کۆمـەڵگاکانی تـر لەرێگـەی بـەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانەوە بەردەوامی هەیە.

مەرج نیە گەنج تەنها لەڕووی ئایدۆلۆیەوە بکرێتە ئامـانج و بـەڵکوو بابەتـە فەلسـەفی و ناسیۆنالیسـتیەکان و ئاشـنا بـوون بـە گـروپ و

---

[1] ئارام سدیق, گه نج و شو ناس، ، چاپی یەکەم , ساڵی ٢٠٠٧ , ل ٩

دەستەی جیاوازی کۆمەڵایەتی هۆکارگەلێکی زۆر مەترسیدارن بۆ گەنجان ,ژیانی رۆژانەی خۆی و خێزان و کۆمەڵگاکەی بەرەو ناهەمواری و فکری تاکگەرایی و هەڵسوکەوتی نامۆ و دیاردە ناباوەکان دەبات،لەگەڵ ئەوەی دەشێت تاکێکی گەنج تەنها لەرێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانەوە ببێت بە خاوەن کەسایەتیەکی بەهێز و چالاك هەم بۆ برەودان بەژیان و ژیاری خۆی, هەم بۆ کۆمەڵگاش ببێت بە کەسایەتیەکی کاریگەر کەڕەنگدانەوەی هەڵسوکەوتەکانی ببێت بە سەرچاوەیەکی جوان و تەندروست و هۆشیار بۆ چواردەورەکەی , هەروەها گەنج وەك یەکێك لە چینەکانی کۆمەڵگا کە زۆرترین بەکارهێنەری تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانن توانیویانە ببن بە کەسانی ئاشتی خواز, یان هۆکاربوون بۆ تێکەڵاوی کەلتور و داب و نەریتی میللەتانی دونیا و هەروەها چەندین دەستە و گروپی تایبەتمەند دروست بوون بۆ بەهاناوەچوون و بوژاندنەوەی کۆمەڵگا لەئەگەری روودانی هەر رووداوێکی نەخوازراو ( تەندروستی سروشتی , جەنگ , ئاوارەبوون , کۆمەکی کەسانی هەژاری ناو کۆمەڵگا , کۆکردنەوەی پشتیوانی ماددی و مەعنەوی بۆکەسانێك کە پێویستیان بەهاوکاری هەیە).

کەواتە کاریگەری تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان دەکرێت وەك چەمکێکی دوو ڕەهەندی سەیر بکرێت ,چونکە باش و خراپ لە پەروەردەی دەستی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بوونیان هەیە .

٢- لەڕووی رەفتاری ڕۆژانەی گەنجانەوە : گەنج زۆر بەئاسانی دەکەوێتە ژێرکاریگەری چواردەورەکەی بەتایبەت تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان کە زۆر بەئاسانتر دەتوانن گەنج بەئامانج بگرن هەڵسوکەوتی گەنج بەردەوام تا تەمەنی کامڵ بوون لەگۆڕاندایە هەرئەم وەچەرخانە گرنگەی تەمەنی گەنجە وای کردووە بەشێوەیەکی بەرچاو و کارتێکەر لەلایەن کەسایەتی ئاینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت کۆمپانیا و گروپەکانەوە بۆ دروستکردنی کاریگەری تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بەکاربهێنن تاوەکوو گەنج پێی کاریگەربن .

٣- لەڕووی هەستکردن بە لایەنگری حیزب و دەسەلات بەپێوەری نزیك لەجوگرافیای ژیان و ژیاری گەنج و پەلکێشکردنیان بۆناوحیزب و کۆمەڵە و رێکخراوەکان .

٤- لەڕووی بەکارهێنانی گەنج وەك پاڵەوانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بۆنموونە  لەبەشێکی زۆری ڕێکلام و بەرنامە کۆمەڵایەتی و پرسەکانی ژیان و وادەی هەڵبژاردن و پروپاگەندەی سیاسی , پەنا بۆ چینی گەنج دەبرێت , بەو مەبەستەی کە گەنج زیاتر هەست بە ویستی گەنج دەکات و پەیامێك لە گەنجەوە بۆ گەنجێکی بەئامانج کراو زیاتر کاریگەری دەبێت .

٥ –  تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان زیاتر برەو بە تین و توانای گەنج دەدەن لەئەگەری هەبوونی هەر جۆرێك لەپێداویستی کۆمەڵگاکان ,هەروەها تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان باشترین هۆکارێکن بۆ دروستکردنی هەڵوێست بەرامبەر دۆخ یان گێروگرفتێکی نەویستراوی ناوکۆمەڵگاکان .

٦- لەڕووی دروستکردنی رای گشتی : کە زۆرێك لەشارەزایانی بواری میدیا و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بە رای گشتی ئەلیکترۆنی ناوی دەبەن , وەك دەزانین دروستکردنی رای گشتی بریتیە لە کۆدەنگی بەشێك لە تاکی کۆمەڵگا بە بەڵێ یان نەخێر لەسەر بابەتێك ,هەروەها بەلەبەرچاوگرتنی دۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی دروستکردنی کۆدەنگی و رای گشتی کارێکی ئاسان نیە , بۆیە

دەستەی کەسە نارازیەکانی کۆمەڵگا بەتایبەت گەنجان دەتوانن لەرێگەی بەگەرخستنی توانای گەنجان لەتۆڕەکۆمەڵایەتیەکان ئەگەر هیچ نەبێت تەنها بە لایك و پاڵشتی رایەکی گشتی دروست بکەن .

هەرچەندە دەشێت ئاماری راستەقینە رای گشتی لەسەر تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بەدەست نەیەت ,بەڵام دەتوانرێت بەنزیکی ئاست و ویست و ئیرادەی گەنجانی کۆمەڵگا بە کاریگەری بوونیان لە تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بزانرێت , هەروەها زۆرێك لە توێژینەوەزانستیەکان و بەدواداچوونە ئەکادیمیەکان بەسوود بینین لە تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان راو وبۆچوونی کۆمەڵگا وەردەگرن دەربارەی زانست و پرسەکانیان .[1]

نموونە زۆرە بۆ دروست بوونی رای گشتی ئەلیکترۆنی یان کۆکردنەوەی ئیمزای ئەلیکترۆنی , بۆنموونە دروست بوونی رای گشتی ٣٠ ملیۆنی لەبەریتانیا دژی بەرزبوونەوەی نرخی پەیوەندی تەلەفوونی , هەروەها دروست بوونی رای گشتی ئەلیکترۆنی لەئەمریکا دژی زیاد تەرخانکردنی بوودجەی

---

١ د.ماهرعودة الشمالية ,هەمان سەرچاوەی پێشوو, ل ١٤٧

سەربازی هەروەها دروست بوونی رای گشتی ئەلیکترۆنی بۆرووبەڕوو بوونەوەی نەخۆشیەکانی ( ئایدز , کۆرۆنا) لەجیهان هەروەها دروست بوونی کۆدەنگی ئەلیکترۆنی نیشتیمانی لە هەرێمی کوردستان دژی (داعش) هەروەها بۆ نارەزایی پێنەدانی مووچە ... چەندین نموونەی تر هەیە کە رای گشتی ئەلیکترۆنی توانیویەتی کاریگەری گەورە و گرنگی هەبێت لەسەر چارەسەر کردنی کێشەکان .

٧- لەڕووی دروستکردنی پەیوەندی گشتی : کە بە پەیوەندی گشتی ئەلیکترۆنی ناودەبرێت و بریتیەلە هەموو ئەو پەیوەندیە (کۆمەڵایەتی , سیاسی ,وەرزشی , ئابووری , هونەری) یانەی کە لەرێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانەوە دروست دەبێت و کاریگەری تەواوی لەسەر ئاکار و هەڵسوکەوتی گەنجان و تاکەکانی کۆمەڵگا دەبێت, جۆری ئەو پەیوەندیانەش تەنها لە ناوخۆ نیە , بەڵکو بەشێکی زۆر لەپەیوەندیەکان سنورە جوگرافیەکان دەبڕن هەروەها لەیەك ئاستیشدا نین تەواوی ئاستەکان دەگرێتەوە .

# بەشی چوارەم

## ئەنجامی پراکتیکی توێژینەوە

**جێگیری توێژینەوە:**

توێژینەوەکە پشتی بەجێگیری ناوخۆیی بەستوە بۆ داتاکانی توێژینەوە بەبەکارهێنانی هاوکێشەی ئاماری ئەلفاکرونباخ بۆ پرسیارە تەرتیبیەکانی فۆرمی ڕاپرسی کەلەم خشتەیەی خوارەوەدا ڕونکراوەتەوە:

**خشتەی (١)**

**جێگیری توێژینەوە**

| **بڕگە** | **ژمارەی بڕگەکان** | **پێوانەی جێگیری توێژینەوە** |
|---|---|---|
| ئاستی بەکارهێنان | ٤ | ٠,٨١٧ |
| بۆچون | ٤ | ٠,٨٩٦ |

بەپێی ئەنجامی خشتەی (١) دەردەکەوێت کەجێگیری توێژینەوە لەنێوان (٠,٨١٧ – ٠,٨٩٦) دایە کەئاماژەیە بۆ پلەی بەرزی پێوانەی جێگیری بۆ پرسیارە تەرتیبیەکانی فۆرمی ڕاپرسی.

لەم بەشەدا ئەنجامی پراکتیکی توێژینـەوە دەخرێتـەڕوو کەنمایشـی تایبەتمەندی دیموگرافی سامپڵ و وەڵامەکانیان دەکات.

تایبەتمەندی دیموگرافی سامپڵی توێژینەوە:

| خشتەی (٢)تایبەتمەندیدیموگرافی سامپڵی توێژینەوە | | | |
|---|---|---|---|
| تایبەتمەندی دیموگرافی | برگەکان | پاتبوونەوە | ڕێژەی سەدی |
| ڕەگەز | نێر | ٥٧ | ٥٧٪ |
| | مێ | ٤٣ | ٤٣٪ |
| تەمەن | ١٨ساڵ بۆ ٢٢ ساڵ | ٣٩ | ٣٩٪ |
| | لە٢٣ساڵ بۆ٢٧ساڵ | ٢٩ | ٢٩٪ |
| | لە٢٨ساڵ بۆ٣٢ساڵ | ٢١ | ٢١٪ |
| | لە ٣٣ساڵ بۆ زیاتر | ٩ | ٩٪ |
| | خوێندکار | ٣٠ | ٣٠٪ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| پیشه | کاسب | ٣٠ | ٣٠٪ |
| | بێ کار | ٨ | ٨٪ |
| | فەرمانبەر | ١٨ | ١٨٪ |
| | کارمەندی کەرتی تایبەت | ١٤ | ١٤٪ |
| ئاستی زانستی | بنەڕەتی | ١٦ | ١٦٪ |
| | ئامادەیی | ٣٢ | ٣٢٪ |
| | دبلۆم | ٣٢ | ٣٢٪ |
| | خوێندنی باڵا | ٢٠ | ٢٠٪ |
| خەرجی مانگانە | ٢٥٠ هەزار دیناری عێراقی | ٢٢ | ٢٢٪ |
| | ٢٥٠ بۆ ٥٠٠ هەزار دینار | ٤٢ | ٤٢٪ |
| | ٥٠٠ هەزار دینار زیاتر | ٣٦ | ٣٦٪ |
| کۆی گشتی | | ١٠٠ | ١٠٠ |

بەپێی ئەنجامی خشتەی (٢) ژمارەی فۆرمی دابەشکراو کە(١٠٠) فۆرم بوون، لەڕوی رەگەزەوە بەشێوەی(٥٧) نێر و (٤٣) مێ پڕکراونەتەوە و وەلامی پرسیارەکانیان داوەتەوە، بەلام سەبارەت بەتەمەن دەستەی (١٨سال بۆ٢٢سال) (٣٩) کەس، دەستەی (٢٣سال بۆ٢٧سال)، (٢٩) کەس، دەستەی (٢٨سال بۆ٣٢سال) (٢١) کەس، دەستەی (٣٣سال بۆزیاتر)، (٩) کەس بوون گەورەترین دەستەی تەمەن(٣٩) کەسە، هەروەها لەڕووی پیشەوە خوێندکار ( ٣٠)کەس , کاسب ( ٣٠)کەس , بێ کار

(٨)کەس , فەرمانبەر( ١٨) کەس , کارمەندی کەرتی تایبەت(١٤)کەس . هەروەها لەڕووی ئاستی زانستی بەشداربوان بەم شێوەیە بوون,بنەڕەتی( ١٦) کەس ئامادەیی ( ٣٢) کەس دبلۆم ( ٣٢) کەس , خوێندنی بالا ( ٢٠) کەس , هەروەها سەبارەت بەخەرجی مانگانەی بەشداربووان لەچوار خانەی(خەرجی مانگانە ٢٥٠ هەزار ( ٢٢ ) کەس , ٢٥٠ بۆ ٥٠٠ هەزار ( ٤٢) کەس ٥٠٠ هەزار زیاتر ( ٣٦)کەس , کە بەرزترین رێژە خەرجی مانگانەی ٢٥٠ بۆ ٥٠٠ هەزار دینار تۆماری کردوە بریتیەلە ( ٤٢) کەس .

وەڵامی سامپڵی توێژینەوە:

١. ئاستی بەکارهێنانت چەندە بۆتۆڕەکۆمەڵایەتیەکان:بەپێی ئەنجامی خشتەی(٣) ئەو کەسانەی کە بە بەردەوام وەڵامیان داوەتەوە و سۆشیال میدیا بەکار دەهێنن ژمارەیان (٥٢) کەسە وەلێ (٣٧) کەس وەڵامیان داوەتەوە کە هەندێك جاربەکاری دەهێنن هەروەها (١١) کەس بە دەگمەن بەکاری دەهێنن ,ئەمەش دەبێتە جێی تێڕامانی توێژەر کەلەئەمڕۆی جیهانی زانیاریدا توێژێکی گرنگی کۆمەڵەکەمان سەروکاری لەگەڵ سۆشیال میدیادا هەیە وبەکاری دەهێنن.

| خشتەی (٣) ئاستی بەکارهێنانت چەندە بۆتۆڕەکۆمەڵایەتیەکان | | |
|---|---|---|
| بڕگەکان | پاتبوونەوە | ڕێژەی سەدی |
| بەردەوام | ٥٢ | ٥٢ ٪ |
| هەندێك جار | ٣٧ | ٣٧ ٪ |
| بەدەگمەن | ١١ | ١١ ٪ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

٢ رۆژانە چەند کاتژمێر تۆڕی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنی :سەبارەت کاتژمێرەکانی بەکارهێنانی سۆشیال میدیا (٣) کاتژمێر پلەی یەکەمی بە دەستهێناوە، بەرێژەی لەسەدا (٣٦)هەروەها دووکاتژمێر بەکارهێنانی سۆشیال میدیا پلەی دووەمی هەیە کە بەرێژەی (٪٢٦ ) هەروەها (٪ ٢٤) زیاتر لە چوار کاتژمێر بەکاری دەهێنن کەچی بەکارهێنانی یەك کاتژمێر نزمترین داتای تۆمار کردوە کە بریتیە لە (٪ ١٤) بۆزانیاریزیاتربروانەخشتەی(٤).

| خشتەی (٤) رۆژانە چەند کاتژمێر تۆڕی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنی | | |
|---|---|---|
| بڕگەکان | پاتبوونەوە | ڕێژەی سەدی |
| یەك کاتژمێر | ١٤ | ٪ ١٤ |
| دووکاتژمێر زیاتر | ٢٦ | ٪ ٢٦ |
| سێ کاتژمێر | ٢٤ | ٪ ٢٤ |
| چوار کاتژمێر زیاتر | ٧ | ٪ ٧ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

٣- کامانەن لەدیارترین ئەو تۆڕەکۆمەڵایەتیانەی بەکاری دەهێنی :

هەرچی دەربارەی ئەو پرسیارەی کە کامانەن لەدیارترین ئەو

تۆڕەكۆمەڵایەتیانەی كە بەكاری دەهێنی سناپ چات بە پلەی یەكەم وەڵامدراوەتەوە بۆ بەردەوام بەكارهێنان كە ڕێژەكە بریتیە لە (٤٩٪) هەروەها پلەی دووەم بۆ بەردەوام فەیسبووكە كە ڕێژەكە بریتیە لە (٤٢٪) هەروەها پلەی سێهەم ئینستاگرام كە ڕێژەكە بریتیە لە (٣٧٪) پلەی چوارەمیش یوتوب كە ڕێژەكەی بریتیەلە (٣٤٪) هەروەها بۆ وەلامی بڕگەی هەندێك جار بەكاری دەهێنم ئینستاگرام پلەی یەكەمی هەیە كە ڕێژەكەی بریتیەلە (٣٧٪) پاشان سناپ چات بە پلەی دووەم دێت كە ڕێژەكەی بریتیەلە (٢٩٪) هەروەها پلەی سێهەم فەیسبووكە كە ڕێژەكەی بریتیەلە (٢٨٪) پلەی چوارەم یوتوب كە ڕێژەكەی بریتیەلە (٢٣٪) لەوەڵامی بڕگەی كۆتایی ئەنجامی ڕاپرسیەكە بەم جۆرەیە یوتوب بە پلەی یەكەم دێت كە ڕێژەكەی بریتیەلە (٤٣٪) پاشان لەپلەی دووەم فەیسبووك دێت كەڕێژەكەی بریتیەلە (٣٠٪) لەپلەی سێهەمیشدا ئینستاگرام دێت كە ڕێژەكەی بریتیەلە (٢٦٪) لە پلەی چوارەمیش سناپ چات دێت كە ڕێژەكەی بریتیەلە (٢٢٪) . بۆزانیاری زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارەی پێنج .

| خشتەی (٥)کامانەن لەدیارترین ئەو تۆڕەکۆمەڵایەتیانەی کە بەکاری دەهێنی | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| برگە | بەردەوام | | هەندێکجار | | بەدەگمەن | |
| | پاتبوونەوە | ڕێژەی سەدی | پاتبوونەوە | ڕێژەی سەدی | پاتبوونەوە | ڕێژەی سەدی |
| فەیسبووک | ٤٢ | ٤٢٪ | ٢٨ | ٢٨٪ | ٣٠ | ٣٠٪ |
| ئینستاگرام | ٣٧ | ٣٧٪ | ٣٧ | ٣٧٪ | ٢٦ | ٢٦٪ |
| سناپ چات | ٤٩ | ٤٩٪ | ٢٩ | ٢٩٪ | ٢٢ | ٢٢٪ |
| یوتوب | ٣٤ | ٣٤٪ | ٢٣ | ٢٣٪ | ٤٣ | ٤٣٪ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ |

٤- بـــۆ وەڵامـــی پرســـیاری ئایـــا بـــەکارهێنانی هەریـــەك لـــەو تۆرەکۆمەڵایەتیانـــە هـــیچ ســـودێکی کۆمەڵایـــەتی پێگەیانـــدویت : ئەنجامی ئـەم پرسـیارە بـەم جۆرەیـە کـە بۆ پلـەی یەکـەم وەڵامـی هەنـدێك جـار بـە ڕێـژەی (٦٠٪) وەڵام دراوەتـەوە هـەروەها وەڵامـی بەردەوام لەگەڵ بەدەگمەن وەك یەك وەڵام دراونەتەوە کە ڕێژەکەیان بریتیە لە (٢٠٪) . بۆزانیاری زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارەی ٦ .

| خشتەی (٦)ئایا بەکارهێنانی هەریەك لەو تۆرەکۆمەڵایەتیانە هیچ سودێکی کۆمەڵایەتی پێگەیاندویت | | |
|---|---|---|
| برگەکان | پاتبوونەوە | رێژەی سەدی |
| بەردەوام | ٢٠ | ٢٠٪ |
| هەندێك جار | ٦٠ | ٦٠٪ |
| بەدەگمەن | ٢٠ | ٢٠٪ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

٥- ئایا لەوکاتەوەی تۆرە کۆمەڵایەتیەکان بەکار دەهێنی هیچ گۆرانکاریەك لەهۆشیاری کۆمەڵایەتیت هەست پی دەکەیت : بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش کە گوزارشتە لە کاریگەری هۆشیاری تۆرەکۆمەڵایەتیەکان وەڵامی هەندێك جار بە پلەی یەکەم کە رێژەکەی بریتیەلە (٥٧٪) هاتوە , هەروەها وەڵامی بەردەوام بە پلەی دووەم هاتوە کە رێژەکەی بریتیەلە (٢٧٪) پاشان لەپلەی سێهەم وەڵامی بەدەگمەن بە رێژەی (١٦٪) هاتوە ,بۆزانیاری زیاتر بروانە خشتەی ژمارەی ٧ .

| خشتەی(٧)– ئایا لەوکاتەوەی تۆرە کۆمەلأیەتیەکان بەکار دەهێنی هیچ گۆرانکاریەك لەهۆشیاری کۆمەلأیەتیت هەست پی دەکەیت | | |
|---|---|---|
| برگەکان | پاتبوونەوە | رێژەی سەدی |
| بەردەوام | ٢٧ | ٢٧٪ |
| هەندێك جار | ٥٧ | ٥٧٪ |
| بەدەگمەن | ١٦ | ١٦٪ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

٦ – ئـەنجامی فـۆرمی راپرسـی بـۆ پرسـیاری ئایـا بـەکارهێنانی تۆرەکۆمەلأیـەتیـەکان بۆتـە هانـدەرێك تـاوەکوو بەشـداری کرداریـت هەبێت لەپرۆژە هۆشیاریە کۆمەلأیەتیەکان بەوجۆرەیە کە بۆ پلـەی یەکەم هەندێك جار کە رێژەکـەی بریتیەلـە (٥٥٪) هـاتوە , هـەروەها وەلأمـی بەدەگمـەن بـە پلـەی دووەم هـاتوە کـە رێژەکـەی بریتیەلـە (٢٦٪) پاشان لەپلـەی سـێهەم وەلأمـی بـەردەوام بـە رێـژەی (١٩٪) هاتوە ,بۆزانیاری زیاتر بروانە خشتەی ژمارەی ٨ .

| خشتەی(٨)ئایا بەکارهێنانی تۆرەکۆمەڵایەتیەکان بۆتە هاندەرێك تاوەکوو بەشداری کرداریت هەبێت لەپرۆژە هۆشیاریە کۆمەڵایەتیەکان | | |
|---|---|---|
| بڕگەکان | پاتبوونەوە | ڕێژەی سەدی |
| بەردەوام | ١٩ | ١٩٪ |
| هەندێك جار | ٥٥ | ٥٥٪ |
| بەدەگمەن | ٢٦ | ٢٦٪ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

٧ – پێت وایە ئەگەر بەردەوام بیت لەبەکار هێنانی تۆرە کۆمەڵایەتیەکان بتوانیت ببیت بە کەسێکی چالاك بۆ هۆشیارکردنەوەی چواردەورت لەمەترسیەکۆمەڵایەتیەکان : بۆ ئەم پرسیارە وەڵامەکان بە دوو بڕگە لەسەر شێوەی (بەڵێ و نەخێر) وەڵام دراونەتەوە کە وەڵامی بەڵێ بە پلەی یەکەم کەڕێژەکەی بریتیەلە (٦٤٪) وەڵام دراوەتەوە هەروەها وەڵامی نەخێر بە پلەی دووەم هاتوە کە ڕێژەکەی بریتیەلە ( ٣٦٪) بۆزانیاری زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارە ٩

| خشتەی(٩)پێت وایە ئەگەر بەردەوام بیت لەبەکار هێنانی تۆرە کۆمەڵایەتیەکان بتوانیت ببیت بە کەسێکی چالاك بۆ هۆشیارکردنەوەی چواردەورت لەمەترسیەکۆمەڵایەتیەکان | | |
|---|---|---|
| برگەکان | پاتبوونەوە | رێژەی سەدی |
| بەڵێ | ٦٤ | ٦٤٪ |
| نەخێر | ٣٦ | ٣٦٪ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

٨ – ئایا بەکارهێنانی تۆرە کۆمەڵایەتیەکان بەکام باردا زیانی بەتۆ گەیاندوە : بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە لەسەر شێوەی پێنج برگە وەڵام دراوەتەوە کە پلەی یەکەم کات کوژی کەرێژەکەی بریتیە لە (٦٠٪) وەڵام دراوەتەوە, پاشان دابڕانی کۆمەڵایەتی بە پلەی دووەم هاتوە کە رێژەکەی بریتیەلە (١٤٪) پاشان زیانی ماددی و وەڵامی ئاڵودەبوون بە تۆرەکۆمەڵایەتیەکان بە پلەی سێهەم هاتوون کە رێژەکەیان بریتیەلە (١٣٪) پلەی چوارەم و کۆتایی کە وەڵامی هەر زیانێکی تر کە رێژەکەی بریتیەلە (٠٪) هاتوە بۆزانیاری زیاتر بروانە خشتەی ژمارە ١٠

| خشتەی(١٠)ئایا بەکارهێنانی تۆرە کۆمەڵایەتیەکان بەکام باردا زیانی بەتۆ گەیاندوە | | |
|---|---|---|
| برگەکان | پاتبوونەوە | ڕێژەی سەدی |
| کات کوژی | ٦٠ | ٦٠٪ |
| دابرانی کۆمەڵایەتی | ١٤ | ١٤٪ |
| زیانی ماددی | ١٣ | ١٣٪ |
| ئاڵوودەبوون بە تۆرەکۆمەڵایەتیەکان | ١٣ | ١٣٪ |
| هەر زیانێکی تر | ٠ | ٠ ٪ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

٩- پێت وایە لەڕووی هۆشیاریەوە تۆرەکۆمەڵایەتیەکان تەواوی پێداویستەکانی بۆتۆ پڕکردۆتەوە : بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بە بەڵێ یان نەخێر وەڵام دراوەتەوە کە نەخێر پلەی یەکەمی هەیە و ڕێژەکەی بریتیەلە (٦٢٪) هەروەها وەڵامی بەڵێ پلەی دووەمی هەیە کە ڕێژەکەی بریتیەلە (٣٨٪) بۆ زانیاری زیاتر بروانە خشتەی ژمارە ١١ .

**خشتەی(١١)پێت وایە لەڕووی هۆشیاریەوە تۆرەکۆمەڵایەتیەکان تەواوی پێداویستەکانی بۆتۆ پڕکردۆتەوە**

| بڕگەکان | پاتبوونەوە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٦٢ | ٦٢٪ |
| نەخێر | ٣٨ | ٣٨٪ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

# دەرئەنجام و ڕاسپاردە

## دەرئەنجام :

توێــژەر لــەم توێژینەوەیــەدا,دوای شــیکردنەوەی کاریگەریــەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان لەسەر هۆشیاری کۆمەڵایەتی گـەنجان و زانینــی گۆشــەنیگای بەشــداربوانی ڕاپرســیەکە لــەو بارەیــەوە گەیشــتە ئــەم ئەنجامانەی خوارەوە :

١- کاریگەریــەکانی تۆرەکۆمەڵایەتیــەکان لەســەر گــەنجان بــونێکی ڕێژەییە ,چونکە بەلەبەرچاوگرتنی ئاستی جیاوازی خوێنـدەواری وهەبوونی هۆشیاری جیاواز لەبـەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتیـەکان و ناپرۆفیشناڵی خزمەتگوزاریـەکانی تـۆڕی ئینتـەرنێت ونـەبوونی چـــــاودێریەکی بــــــاش وای کردووەکاریگــــــەری ئــــــەرێنی تۆرەکۆمەڵایەتیەکان بە هەڵسوکەوتی گەنجانەوە دیاربێت .

٢- ڕێژەیــەکی دیــاریکراو لەگــەنجان لــەپارێزگای ســلێمانی تــۆڕی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنن.

٣- بەشـــــی زۆری ســـــامپڵی توێژینــــەوە دەریدەخــــەن کـــە تۆڕەکۆمەڵایەتیــەکان هانــدەرێکن تــاوەکوو گــەنجان هۆشــیاری کۆمەڵایەتیان زیاد بکات .

٤- جیاوازی بەرچاو لەنێوان سامپڵی توێژینەوەکەدا بەرجەستەبووە بــەپێی تایبەتمەندییــە دیموگرافیــە دیاریکراوەکــان کەلــە فــۆڕمی راپرسیدا ئاماژەی پێکراوە.

٥- ســناپ چــات وەك یەکــەمین تــۆڕی کۆمەڵایــەتی کــە لەلایــەن گەنجانەوە زۆرترین کات بەکار دێت بە پلەی یەکەم دێت تۆمـار کــراوە هــەروەها فەیســبووك وەك دووەم تــۆڕی کۆمەڵایــەتی و ئینســـتاگرام وەك ســێهەم و یوتـــوب وەك چـــوارەم تـــۆڕی کۆمەڵایەتی کەلەلایەن لێتوێژراواندا دیاری کراوە.

٦- لــە بــارودۆخی ئێســتا بەتایبــەتی لــە خۆرهــەڵاتی ناوەڕاســت و جیهـــانی عـــەرەبی و دەوڵـــەتانی ئیســـلامی بـــە عێـــراق و کوردستانیشەوە, ئاماژەکان وای دەردەخەن کە سۆشیال میـدیا کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر تـاك لـە کۆمـەڵگادا چـونکە هــەموو کەســێك دەتــوانێ لــە ڕێگــەی مۆبایــل یــان ئــامێرە زیرەکەکانەوە فەیسبووك یان تویتەر یان هەر سایت و پێگەیەکی

ئینتەرنێتی بەکاربێنێت و کاریگەر ببێت بەو پەیام و بابەتانەی کە لەتۆڕەکۆمەلآیەتیەکانەوە پەخشدەکرێن .

٧- یەکێك لە گرنگترین دەرئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە ئەوەیەکە بەشێکی زۆر لە بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەلآیەتیەکان و ئینتەرنێت هیچ جۆرە ئاگاییەکیان نیە لە مەترسیەکانی تۆڕەکۆمەلآیەتیەکان , چونکە ئەوەی زیاتر رەنگدانەوەی هەیە و هەستی پێدەکرێت و بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاریگەریەکانی دەردەکەون بریتیە لە لایەنە باشەکانی ئەم خزمەتگوزارییە.

لەبەر ئەوەی دەوراتی هۆشیاری و توێژینەوەی زانستی و بەدواداچوونە زانستیەکان بۆ ئەو بابەتە(تۆڕەکۆمەلآیەتیەکان و مەترسیەکانی ) زۆر کەمن , نەبوونی هۆکارەکانی هەست کردن بە مەترسیەکانی دەرخەری ئەم ڕاستیەیە کە گاریکەریەخراپەکانی تۆڕەکۆمەلآیەتیەکان و ئینتەرنێت بەشێوەیەکی زۆر بوونی هەیە . مەترسیەکانیش یاخوود کاریگەریەکانی تۆڕەکۆمەلآیەتیەکان هەمەجۆرن (جەستەیی , ئاکاری , هەلسووکەوت , زانیاری ,کات کوژی ) هتد .

راسپاردەکان :

توێـژەر دوای ئەنجامـدانی ئـەم توێژینەوەیـە و گەیشـتن بـە چـەند ئەنجامێك , بەباشی دەزانێت لەپێناو تێگەشت لە بنـەما ئاکاریـەکانی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و هەست کردن بـە بەپرسـیارێتی و شـێوازەکانی بـەکارهێنان و زانینـی ئاسـتی کاریگەریـەکانی لەسـەر توێژی گەنجان چەند راسپاردەیەك بخاتە ڕوو :

١– سەنتەرێکی میدیایی لە هەرێمی کوردستان بکرێتەوە کە تایبەت بێـت بـە پرسـە میدیایـەکان لەناویـدا پرسـی بـەکارهێنانی تۆرەکۆمەڵایەتیـەکان ,بۆئـەوەی زانسـتیانە رەهەنـدە بـاش و خراپەکانی بەکارهێنانی ئەم تۆڕانە بـۆ بەکارهێنـەران بەگشـتی و گەنجان بەتایبەتی شیبکرێتەوە.

٢– هەوڵ بدرێت یاسایەکی چڕ و ورد لەپەرلەمانی کوردستان گەڵاڵـە بکرێت ,تاوەکوو بەشێوەیەکی یاسایی مافی قوربانیـان و سـزای خراپ بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان دەست نیشـان بکـات چـونکە وەك دەرکـەوتووە رۆژانـە و سـات بەسـات پێگـەی ئەلیترۆنیەکان ژمـارەی بەکارهێنـەرانیان لـەزیاد بووندایـە لەگـەڵ ئـەوەی جـۆر و ژمـارە و کـواڵیتی کاریگەریـە دەروونـی و تەندروستیەکانیش زیاد دەکەن

٣- كـــــاركردن لەســـــەر شــــيكردنەوەى كاريگەريـــــەكانى تۆرەكۆمەلآيەتيەكان لەسەر تويـَژى گەنجان لـە ريَگـەى خـول و سـيمينار و ۆرك شـۆپ , لەلايــەن تويَــژەران و شــارەزايان و مامۆسـتايانى زانكـۆ , بۆئــەوەى زانسـتيانە ريَگـا چـارەكانى خۆپاريَزى لە كاريگەرييەكانى تۆڕە كۆمەلآيەتيەكان و ئينتەرنيَت ئاشنا بن بە بەكارهيَنەرانى بەگشتى و گەنجان بەتايبەتى .

٤- هـەولْ بـدريَت لـە كايـەكانى خويَنـدنى سـەرەتاى بـە ريَژەيـەكى ديارى كراو ئاماژە بە تۆرەكۆمەلآيەتيـەكان بـدريَت تـاوەكوو تـاك هۆشـيارى هــەبيَت لەبارەيانــەوە, كـە رەنگـە ئـەم هۆشـياربيە سـەرەتاييە ببيـَت بـە پـاش خـانيَكى زانسـتى بـۆ بـەكارهيَنانى تۆڕەكۆمەلآيەتيەكان لەداهاتوياندا , كە ئەگـەرى هەيـە ببيـَت بـە هاوكاريَكى باش بۆ خۆبەدوور گرتن لە مەترسيەكانى و شارەزايى لە بەكارهيَنانى تۆڕە كۆمەلآيەتيەكان .

٥- تۆڕەكۆمەلآيەتيـەكان وەك فەزايـەكى جـەنجالْى كـراوە بـەڕووى بەكارهيَنەران دەتوانيـَت ببيـَت بـە فيَرگەيـەكى راهيَنـان و ريَبـەر ئەمـەش لـە دووتـويَى دەرخسـتەى كاريگەريـەكان سـەلميَندراوە لەبەر ئەوە تويَژەر ئـەوە دەخاتـەڕوو كـە بـاش وايـە هەولْبـدريَت بۆچەند سالْى داهاتوو تويَژينـەوە زانسـتيەكانى بەشـى تـەكنيكى ميـديا لــە زانكـۆ و پــەيمانگاكان زيــاتر تايبــەت بكريَـت بــە

لێکۆڵینەوە لەسەر تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و ئینتەرنێت تاوەکوو زۆرترین زانیاری و ئەگەرە باش و خراپەکان دەربارەیان بخرێتەڕوو .

## پێشنیار :

١. زانستی: کاریگەری سۆشیال میدیا لەهۆشیاری کۆمەڵایەتی لای گەنجان لەهەرێمی کوردستان.

٢. پراکتیکی: پێشنیار دەکەم کە بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان لەهەرێمی کوردستاندا گرنگی زیاتر بدەن بە هۆشیاریە کۆمەڵایەتیەکانیان , پاڵپشت بە ئینتەرنێت و خزمەتگوزاریە فراوان و هەمەچەشنەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان لەبەر ئەوەی بەدرێژی لەبەشی تیۆری نامەی ئەم توێژینەویە ئەوەخراوەتە ڕوو کە لەئەگەری نەبوونی هۆشیاری گشتی دەربارەی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و ئینتەرنێت بەکارهێنەر ڕووبەڕووی چەندین مەترسی دەبێتەوە کە مەترسیەکان بریتین لە مەترسی ( تەندروستی ,ماددی , دابڕانی کۆمەڵایەتی ئاڵوودەبوون, کاریگەری تیرۆر و تاوانە ئەلیکترۆنیەکان گێچەڵەسێکسیەکان) .

پاشان لەبەشی پراکتیك نامە ئەوە خراوەتەڕوو کە بەشێکی زۆر لە بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و ئینتەرنێت هۆشیاری بەکارهێنانینان نیە یان زۆر کەمە , لەبەر ئەوە وەك پێشنیارێکی گشتگیر و زانستی پێشنیار دەکەم بەکارهێنەران بەگشتی و گەنجان بەتایبەت بەوریاییەکی زۆر وبەئاگایی تەواو لە سەر تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و ئینتەرنێت ببن بە بەکارهێنەر تاوەکوو تاکێکی سەلامەت و کۆمەڵگایەکی سەلامەت بەرهەم بێت کۆمەڵگاکان بەگشتی و کۆمەڵگای کوردی بەتایبەت ببێت بە بەکاربەرێکی باشی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و سوودی زیاتر لە لایەنەباشەکانی ئینتەرنێت و تۆڕکۆمەڵایەتیەکان ببینن . 

# سەرچاوەکان


١) القـــران الكريم

کوردی :

٢) بـــەهادین احمد,و.رابـــەر رشـــید پەیوەندیەگشـــتیەکان لەدامـــەزراوەکانی راگەیاندن,چاپخانەی چوارچرا ,چاپی یەکەم , ٢٠١٩

٣) د.یونس شوکرا ,و.ڕەحـیم سورچـی ,هەواڵنوسـی مـۆدێرن, چـاپی یەکـەم چاپخانەی ئاراس , ٢٠١١

٤) د.محمد علی بدوی , لێکۆڵینەوەی سۆسیۆ مێدیایی , و.مەم بورهـان قـانع چاپی یەکەم, چاپخانەی پیرەمێرد ٢٠١٤ , سلێمانی لاپەرە ٩٥

٥) محمـد عبـدالله کـەلاری ,جیهـانگیری میـدیا , چـاپخانەی خـانی , دهـۆك چاپی یەکەم, ساڵی ٢٠٠٩

٦) ســیاوەش گــۆدەرزی ,پێشوەچـوونە میدیایــەکان , چــاپخانەی ئــاراس هەولێر , چاپی یەکەم, ساڵی ٢٠١٢

٧) علی عبدالرحمن,و.کاروان محمد ,هونـەری کارامـەیی کـارکردن لـە رادیـۆ و تەلەفزیۆندا , چاپخانەی موکوریانی , هەولێر , چاپی یەکەم,٢٠١٣

٨) د.هێرش رسول ,ئیتیك و یاسا لەمیدیای کوردیدا,چەند وتارێـك دەربـارەی میدیای کوردی , چاپخانەی سەردەم,سلێمانی ,چاپی یەکەم

٩) عبدالخالق ابراهيم ,میدیای کوردی لەسەردەمی ئاسمانە کراوەکاندا,چاپخانەی موکریانی ,هەولێر, چاپی یەکەم,ساڵی ٢٠١٤

١٠) محمد علی وەلی , راگەیاندن ,کۆمەڵە وتار , چاپخانەی رۆژهەلأت, هەولێر چاپی یەکەم , ساڵی چاپ ٢٠١٣

١١) نەعیم بەدیعی , رۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی , و. کارزان محمد , چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم , سلێمانی , ٢٠٠٠

١٢) د.عبدالواحید مشیر دزەیی ,کاریگەری دەروونی لەبواری راگەیاندا دەزگای ئاراس , هەولێر , ساڵی چاپ ٢٠٠٩

١٣) محمد بن مسعود البشیر ,سەرەتایەك لەپەیوەندی کردنی سیاسی ,و.مەم بورهان قانع ,چاپخانەی بیایی ,چاپی یەکەم ,٢٠٠٧

١٤) ئاریان فەرەج ,بەرپرسیارێتی کۆمەلأیەتی رۆژنامەنووس , چاپخانەی رۆشنبیری ,هەولێر ,ساڵی ٢٠١٣

١٥) نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد , فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی و ڕەخنەیی , چاپخانەی بینایی , ساڵی ٢٠١١,چاپی یەکەم

١٦) عبدالموتەلیب عبدالله , خوێندنەوەی پەراوێز پەراوێزی خوێندنەوە , چاپخانەی رۆژ هەلأت , هەولێر , چاپی یەکەم , ساڵی ٢٠١٢

١٧) ئەفلاتوون , کۆمار , و. سۆران عمر,رێبوار قارەمان ,مهدی حسن چۆمانی هەولێر , چاپی یەکەم , ساڵی ٢٠٠٦

١٨) حەمەی ئەحمەد رسول ,خوێندنەوەی سۆسیۆلۆژی بۆ : ژن گەنج منداڵ ,
چاپخانەی یاد , چاپی یەکەم , ساڵی ٢٠١٣

١٩) سەید کەمال ئیبراهیمی , سمکۆ , چاپخانەی لەریا , سلێمانی , چاپی یەکەم , ساڵی ٢٠١٢

٢٠) ئاوات عبدالله , سیاسەت و بەرپرسیارێتی , چاپخانەی رەنج , چاپی یەکەم , ساڵی ٢٠٠٧

٢١) ئارام سدیق گە نج و شو ناس، ، چاپی یەکەم , ساڵی ٢٠٠٧

٢٢) لەبارەی ڕاگەیاندنەوە, مەم بورهان قانیع.

عەرەبی :

٢٣) د.عبدالفتاح التميمى ,د.وليد سلامة ,الشبكات المعلية والانترنت قاهرة ٢٠٠٧

٢٤) مشتاق طلب فاضل , وسائل الاعلام الاجتماعى وتوجها العدوانى فى التجنيد والدعاية للارهاب ,٢٠١٥

٢٥) د.ماهر عودةالشمالية , د.محمود عزت للحام ,د. مصطفى يوسف كافى الاعلام الرقمى الجديد, عمان , چاپی یەکەم , ٢٠١٥

٢٦) د.ياس خضير البياتى ,الاتصال الرقمى , امم صاعدة امم مندهشة الامارات , ٢٠١٥

٢٧) د.عماد عبدالوهاب الصباغ ,علم المعلومات , دار الثقافة للنشر والتوزيع الاردن

٢٨) د.رضا عبدالواحد امين ,الصحافة الكترونية, چاپى يەكەم چاپخانەى دارفجر القاهرة لا٩١

٢٩) د. على على فهمى , استعمال الانترنيت فى تمويل الارهاب وتجنيد الارهابيين ,الرياض , ٢٠١٢ چاپى يەكەم , ل ٩٥

٣٠) عقيد .د. فهد بن عبدالعزيزالغفيليى , الاعلام الرقمى

٣١) لوسيان سفيز , ترجمة, مرح على ابراهيم , التواصل عبر وسائل الاعلام والاعلان , بيروت , ٢٠١١

٣٢) د. محمد سيد محمد , وسائل الاعلام من المنادى الى الانترنيت ,دار الفكر العربى , ٢٠٠٩

٣٣) عقيد. د. عطا الله بن فهد السرحانى ,توظيف الشبكات التواصل الإجتماعى فى مكافحة الارهاب , ٢٠١٣ , سعودية

٣٤) نهـا السـيد عبـدالمعطى , صـحافة المـواطن نحـونمط إتصـالى جديـد , دار الكتاب الجامعى , بيروت , ٢٠١٥

٣٥) خالد وليد محمود ,شـبكات التواصـل الاجتمـاعى وديناميكيـة الـتغير فـى العالم العربى , دار المدارك للنشر ,بيروت , ٢٠١١

٣٦) محمد النعامنـة ,تكنولوجيا الاتصالات والشبكات الحاسوبية, ليث الكبيسى داراثراء للنشر ,عمان, ٢٠٠٩

٣٧) د.صادق رابح ,الاعلام والتكنولوجيـا الحديثـة , چاپى يەكەم , ئيمـارات ٢٠٠٤

٣٨) د. علـى محمـود ابوليلـة , الاعـلام والمجـتمح ,قرطبـة للنشـر والتوزيـع الرياض ,٢٠١٤

٣٩) جمال سند السويدى , وسائل التواصل الاجتماعى ودورها فى التحـويلات المستقبلية من القبيلة إلى الفيسبوك , چاپى يەكەم , ٢٠١٣

٤٠) عـامر وهـاب غلـف العـانى , الاعـلام ودور فـى المعالجـة ظـاهرة الارهـاب والموقف من المقاومة , دار حامد للنشر , عمان , ٢٠١١

٤١) بسمة قائد البناء , تـويتر والبنـاء الاجتمـاعى والثقـافى لـدى شـباب , دار فارس للنشر, الاردن ,٢٠١٤

٤٢) مصعب حسام الدين قتلونى , ثورات الفيسبوك ,الطبعة الاولى ,بيروت

٤٣) د.ماجـد سـالم تربـان , ألانترنيـت والصـحافة ألالكترونيـة , دار المصـرية اللبنانية , چاپى يەكەم ٢٠٠٧

٤٤) مصعب حسام الدين قتلونى , ثـورات الفيسـبوك ,الطبعـة الاولى ,بـيروت ٢٠١٤

٤٥) عـامر وهـاب خلـف العـانى , الاعـلام ودورة فـى المعالجـة ظاهرةالارهـاب والموقف من المقاومة , عمان , داروالمكتبة الحامد ,چاپى يەكەم , ٢٠١٣

ئينگليزى :

٤٦) Jeremy harris lipschults , social media communication ,second edition , printed in the uk, ٢٠١٨

٤٧) Jean burgess , Alice morwick ,and Thomas poell , The sage hand book of social media- ٢٠١٨

٤٨) Manta dalal, modern communication with social media , first edition ,٢٠١٩ ,

٤٩) Beki winchel , Kenneth D. plawman, The social media communication matrix ,printed by business export , ٢٠١٥

٥٠) Eugene mctaughlin, Ross fergusson and Gordon hughes , Restorative justice critical issues , uk , ٢٠٠٣ ,

٥١) Angela underwan ,young childrens health and well-being , first puplish , ٢٠٠٧ , England

**توێژینەوە :**

١) **توێژنەوەی توێژەران(غزال مریم,شعوبی نورالهدی)تأثیرمواقع التواصل الاجتماعی علی تنمیة الوعی السیاسی الدی الطالبة الجامعین, ٢٠١٤**

٢) **ماستەر نامەی مریم نەریمان نومار , استخدام مواقع شبكات الإجتماعیة وتأثیر فی العلاقات الإجتماعیة , جزائیر , ٢٠١٢**

٣) **اسامة غازی المدنی ,دور شبكات التواصل الاجتماعی فی تشكیل رأی العام لدی طلبة الجامعات السعودیة , سعودیة , ٢٠١٤**

٤) **شیما بلونس ,دور وسائل الاعلام والاتصال الجدیدة فی التغیرات السیاسی رسالة ماجستر ,جامحة الجزائیر , غیر منشور , ٢٠١٥**

٥) حسن قطيم طماح المطيرى ,الاستخدامات السياسية لموقحالتواضا الاجتماعى تويتر من قبل شباب الكويتى , رسالة ماجستر(غيرمنشور) كلية الاعلام , جامعة الشرق اوسط ,٢٠١٣
٦) د.شيركو جبارمحمد , د. هةزار محمد جلال , الاستخدام مواقح التواصل الاجتماعى وانكعاساتها على القيم الاجتماعية لدى الطلاب جامعات اقليم كردستان – العراق , الدراسة ميدانية , جامعة بوليتكنيك السليمانية

**گۆڤار :**

١) گۆڤارى رۆژنامەنووس ,زستانى ٢٠١٣ ژمارە(٣٠) ميدياى كۆمەلأيەتى
٢) گۆڤارى ئايديا ژمارە (٢٩ – ٣٠)
٣) گۆڤارى رۆژنامەنووس , ژمارە ٢٠ ,٢٠١٠

## **سايت :**

١) www.merriam- Com webster.com/dictionary/social٪٢٠media

٢) Econsultancy.com/what-is-social-media-here-are-٣٤-definitions

٣) https://techcrunch.com/facebook-says-٥٠-million-accounts-affected-by- -

٤) https://en.wikipedia.org/wiki/Facebook#User_growth

٥) https://ckb.wikipedia.org/wiki/%DB

٦) https://ckb.wikipedia.org/wiki/%D ٩

٧) https://dictionary.cambridge.org/us/dictionary/english/influence

٨) https://www.almaany.com/ar/dict/ar-

٩) https://www.thefreedictionary.com/caution

١٠) http://www.moqatel.com/openshare/Behoth/Mnfsia.doc_cvt.htm٠١/sec١/Social Cons١٥

١١) https://mawdoo

١٢) https://www.brandwatch.com/blog/youtube-stats

١٣) https://www.webwise.ie/parents/what-is-youtube

١٤) https://www.theodysseyonline.com/why-instagram-is-ruining-society

١٥) http://expandedramblings.com/index.php/importantinstagram-statsh

١٦) https://expandedramblings.com/index.php/important-instagram-stats

١٧) https://smallbiztrends.com/using-instagram-for-business.html
١٨) www.kurdipedia.org
١٩) https://napoleoncat.com/stats/facebook-users-in-iraq
٢٠) www.kurdipedia.org
٢١) www.makewebsitehub.com
٢٢) www.webdesignerdepet.com

# پـــــــاشكۆكان

## پاشكۆی ژماره (١)

فۆرمێكی سەرەتایی زانیاری كۆكردنەوه

ناونیشانی توێژینەوه :

# تۆڕەكۆمەڵایەتیەكان وهۆشیاری كۆمەڵایەتی گەنج

بەشداربووی بەرێز هەوڵ بده بەراستی و دروستی وەڵامی پرسیارەكانی ناو ئەو فۆرمەی بەردەستت بدەیتەوه چونكه وەڵامەكانی بۆ منی توێژەر زۆر گرنگه و داخلی ناو توێژینەوەیەكی زانستی دەبێت كه رەنگەلەداهاتودا ببێت بەسەرچاوەیەك بۆ دەست كەوتنی داتاو زانیاری بەسوود لەسەر بەكارهێنانی تورەكۆمەڵایەتەكان لەهەرێمی كوردستاندا

سەرپەرشتیار — توێژەر

پ.ی.د.رێبەر گۆران فستەفا — گۆران زیاد سمایل

## پاشکۆی ژمارە (٢)

## فۆرمی ڕاپرسی

بەشداربووی بەڕێز هەوڵ بدە بەڕاستی و دروستی وەڵامی پرسیارەکانی ناو ئەو فۆرمەی بەردەستت بدەیتەوە چونکە وەڵامەکانی بۆ منی توێژەر زۆر گرنگە و داخلی ناو توێژینەوەیەکی زانستی دەبێت کە ڕەنگەلەداهاتودا ببێت بەسەرچاوەیەك بۆ دەست کەوتنی داتاو زانیاری بەسوود لەسەر بەکارهێنانی تورەکۆمەڵایەتیەکان لەهەرێمی کوردستاندا .

١ – ڕەگەز : نێر ( ) مێ ( )

٢ – تەمەن : ١٨بۆ٢٢ ( ) ٢٣ بۆ ٢٧ ( ) ٢٨ بۆ ٣٢ ( ) ٣٣ بۆ زیاتر ( )

٣ – پیشە : خوێندکار ( ) کاسب ( ) بێ کار ( ) فەرمانبەر ( ) کارمەندی کەرتی تایبەت( )

٤ –ئاستی زانستی : بنەڕەتی ( ) ئامادەیی ( ) دبلۆم ( ) خوێندنی باڵا ( )

٥ – خەرجی مانگانە : ٢٥٠ هەزار دینار ( ) ٢٥٠ بۆ ٥٠٠ هەزار دینار ( ) ٥٠٠ هەزار زیاتر ( )

## پرسیارەکانی توێژینەوە

١–ئاستی بەکارهێنانت چەندە بۆ تۆڕەکۆمەلآیەتیەکان ؟

بەردەوام ( ) هەندێك جار ( ) دەگمەن ( )

٢ – ئەگەر بەکاری دەهێنی ڕۆژانە چەند کاتژمێر بەکاری دەهێنی ؟

یەك کاتژمێر ( ) دوو کاتژمێر ( ) سیٚ کاتژمێر ( ) چوار کاتژمێر و زیاتر ( )

٣ کامانەن لەدیارترین ئەو تۆرەکۆمەلآیەتیانەی کە بەکاریان دەهێنیت ؟

| بڕگە | بەردەوام | هەندێك جار | بەدەگمەن |
|---|---|---|---|
| فەیسبووك | | | |
| ئینتساگرام | | | |
| سناپ چات | | | |
| یوتوب | | | |

٤ – ئایا بەکارهێنانی هەریەك لەو تۆرەکۆمەلآیەتیانە هیچ سودێکی کۆمەلآیەتی پێگەیاندویت ؟

بەردەوام ( ) هەندێك جار ( ) بەدەگمەن ( )

٥– لەوکاتەوەی تۆرە کۆمەلآیەتیەکان بەکار دەهێنی گۆرانکاری لەهۆشیاری
کۆمەلآیەتیت هەست پی دەکەیت؟

بەردەوام ( ) هەندێك جار ( ) بەدەگمەن ( )

٦ – ئایا بەکارهێنانی تۆرەکۆمەلآیەتیەکان بۆتە هاندەرێك تاوەکوو بەشداریت
کرداریت هەبێت لەپرۆژە هۆشیاریە کۆمەلآیەتیەکان ؟

بەردەوام ( ) هەندێك جار ( ) بەدەگمەن ( )

٧ – پێت وایە ئەگەر بەردەوام بیت لەبەکار هێنانی تۆرە کۆمەلآیەتیەکان
بتوانیت ببیت بە کەسێکی چالاك بۆ هۆشیارکردنەوەی چواردەورت
لەمەترسیەکۆمەلآیەتیەکان ؟

بەلێ ( ) نەخێر ( )

٨ – ئایا بەکارهێنانی تۆرە کۆمەلآیەتیەکان بەکام باردا زیانی بەتۆ گەیاندوە ؟

کات کوژی ( ) دابرانی کۆمەلآیەتی ( ) زیانی ماددی ( )
ئالۆدەبوون ( ) هەرزیانێکی تر ( )

٩ – پێت وایە لەرووی هۆشیاریەوە تۆرەکۆمەلآیەتیەکان تەواوی
پێداویستەکانی بۆتۆ پرکردۆتەوە؟

بەلێ ( ) نەخێر ( )

## پاشکۆی ژماره (۳) وێنەی دایاگرافی







MONTHLY USERS
2 B
1.5 B
1 B
500 M
2 B
JUNE 2017
1.5 B
JUNE 2017
700 M
APRIL 2017
328 M
APRIL 2017
1.2 B
FEB 2017
255 M
(APPROX.)
MAY 2017
1.2 B
APRIL 2017
889 M
DEC 2016
FACEBOOK
YOUTUBE
INSTAGRAM
TWITTER
WHATSAPP
SNAPCHAT
FACEBOOK MESSENGER
WECHAT


US Facebook Users by Age
InsideFacebook.com, 7/1/2010
13-17
10%
55-65
7%
45-54
13%
35-44
18%
26-34
23%
18-25
29%
Source: gold.insidenetwork.com/facebook
Data from Facebook.com July, 2010
INSIDE NETWORK


MONTHLY USERS ON FACEBOOK 2004-2017
2000
1500
1000
500
0
2004
2006
2008
2010
2012
2014
2016


Estimated users per employee
2,300,000 users
per employee
2,500k
2,000k
1,500k
1,000k
500k
0k
When Facebook
bought Instagram
tumblr.
Blogs per employee
Tumblr
Instagram
Data sources: Business Insider, Tumblr, Wikipedia.
www.pingdom.com


Facebook users by age
as of January 1, 2010
55–65
45–54
35–44
26–34
18–25
13–17
2,446,600
4,177,260
4,498,480
7,304,500
7,672,220
10,133,780
9,714,020
12,280,700
13,496,460
14,688,420
4,636,220
5,875,460
15M
10M
5M
0M
5M
10M
15M
Male
Female


SEP 2012
FACEBOOK USERS BY CONTINENT
we are social
236M
242M
251M
46M
134M
15M

# Abstract

After the emergence of the social networks in the middle of ninetieth in ٢٠th century for making social networks among the members of the communities. The net has become a major part of the citizens which led to over one billion participants who share information in different ways such as: video, photos and writing. The provided services by the social networks has dragged users attention, among all of the services, one in particular is social awareness which is the main topic of this study. The effects on the matter will be discussed especially on the youth. Moreover, to attain the related data and information on the knowledge of the youth about social networks, we should pertain to psychology, and sociology sciences, because social awareness will differ according to the community, personal intelligence, and geography. Due to thereof, the researcher, based on the resources, new data, and surveys is striving to deduce to which extent the social networks have impact on social awareness among the youths in Slemani. That's, to achieve a new academic and scientific data on the effects of

social networks on the youths and the way they use the social networks. This is mostly because of the impact of social media, as a new media outlet sneaked out into our smartphones and other like. The easy-usage of the social networks and the way the youths use them has led to have different level of social awareness in general especially among the youths

**ملخص البحث :**

بعد ظهور الشبكات الاجتماعية في منتصف التسعينات في القرن العشرين لصنع شبكات اجتماعية بين أفراد المجتمعات. أصبحت الشبكة جزءًا رئيسيًا من المواطنين ، مما أدى إلى مشاركة أكثر من مليار مشارك في المعلومات بطرق مختلفة مثل: الفيديو والصور والكتابة.

جذبت الخدمات المقدمة من الشبكات الاجتماعية انتباه المستخدمين ، من بين جميع الخدمات ، واحدة على وجه الخصوص هي الوعي الاجتماعي الذي هو الموضوع الرئيسي لهذه الدراسة. سيتم مناقشة الآثار على هذه المسألة خاصة على الشباب. علاوة على ذلك ، للوصول إلى البيانات والمعلومات ذات الصلة حول معرفة الشباب حول الشبكات الاجتماعية ، يجب أن نتعلق بعلوم النفس وعلم الاجتماع ، لأن الوعي الاجتماعي سوف يختلف وفقًا للمجتمع والذكاء الشخصي ، والجغرافيا.

نتيجةً لذلك ، يسعى الباحث ، استنادًا إلى الموارد والبيانات الجديدة والمسوحات ، إلى استنتاج مدى تأثير الشبكات الاجتماعية على الوعي الاجتماعي بين الشباب في السليماني. وذلك لتحقيق بيانات أكاديمية وعلمية جديدة عن تأثيرات الشبكات الاجتماعية على الشباب وكيفية استخدامهم للشبكات الاجتماعية.

**هذا يرجع في الغالب إلى تأثير وسائل التواصل الاجتماعي ، حيث تسللت وسائل الإعلام الجديدة إلى هواتفنا الذكية وغيرها. أدى الاستخدام السهل للشبكات الاجتماعية والطريقة التي يستخدمها الشباب إلى الحصول على مستوى مختلف من الوعي الاجتماعي بشكل عام وخاصة بين الشباب.**